# ستۆری و بنەما نێودەوڵەتییەکانی کاری ڕۆژنامەگەری

نووسینی

فرمان عەبدولڕەحمان

سۆزانا فیشەر پێشەکی بۆ نووسیوە

## پێشەکی

## بە پێنوسی رۆژنامەنووسی ئەڵمانی سۆزانا فیشەر

وەك رۆژنامەنووس لە قوتابخانەی (هێنری نانێن) بۆ رۆژنامەگەری لە شاری هامبۆرگی ئەڵمانیا راهێنانم وەرگرتووە و فێربووم کەوا دەبێت هەواڵ کورت و پوخت و روون بێت و ماددەی زۆر گرنگ لە بەشی سەرەتای هەواڵەکەدا دابنێم. ئێمە گەلێك کاری لێکۆڵینەوەیی و چاوپێکەوتن و کۆمێنتەریمان بە پراکتیکی بە ئەنجام گەیاندوە، بۆ ئەو مەبەستەش لە لایەن ئەو قوتابخانەیەوە دەنێردراین بۆ هەموو لایەك تاوەکو لە راپۆرتکردن تاقیمانبکەنەوە.

بەڵام کە هاتمە عێراق بۆ راهێنانی رۆژنامەنووسان وانە وتنەوەم لە عێراق کەمێك جیاوازی پێوەدیاربوو. بێگومان ئەو وانانەی دەمانوتەوە لە ئەنیستیتیۆی رۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی (IWPR)، کۆمەڵە زانیارییەك بوون دەربارەی «ستانداردی نێودەوڵەتی کاری رۆژنامەگەری»، هەرچەندە زۆربەی کۆرسی پرۆگرامی راهێنانەکە، کە دەنووسرایەوە پەیوەندیدار بوون بە ژیانی رۆژانەی قوتابییەکانمان، بەڵام پەرتووکی کۆرسی راهێنانەکە لەوانەیە گونجاوترین ماددەی خوێندنەوە بوو بێت بۆ ئەوان.

لە یەکێك لە کۆرسەکاندا کچێکی گەنجی خەڵکی کەلار پرسیاری ئەوەی کرد «گەر کەسێك ببینم بریندار بێت ئایا پێویستە وێنەی بگرم، یاخود لە پێشدا یارمەتیان بدەم»، منیش ویستم زیاتر بزانم، پرسیم «ئایا تۆ خۆت تووشی ئەو جۆرە بڕیاردانە بوویتەتەوە؟»، لە وەڵامدا وتی: «بە هۆی بێزاری و ماندووبوونی خەڵك لە بوونی ٤ کاتژمێر کارەبا لە رۆژێکدا ئێمە خۆپیشاندانێکمان کرد، بەڵام پۆلیس بە فیشەك وەڵامی داینەوە و یەکێك لە خۆپیشاندەران دوای ئەوەی بریندار بوو، کەوتە سەر زەوی و منیش بە خۆم و کامێراکەمەوە بۆ لای رامکرد. پیاوە بریندارەکە لە پێشدا داوای لێکردم کە دەستەسڕێکی بدەمێ بۆ ئەوەی دەموچاوە خوێناوییەکەی پێ بسڕێ»، ئەو کیژە پرسیاری لێکردم ئایا لەو کاتەدا کە خوێنەکەی دەموچاوی سڕی، وێنەکە رەسەنی خۆی لە دەست نادات؟



پرسیارەکان رەنگدانەوەی ژیانێك بوون، هەر یاسا و پێناسەیەك کە لە کۆرسەکاندا دەمخستەروو خێرا قوتابییەکان وەریاندەگێڕایە سەر واقیعی راستەقینەی خۆیان کە عێراقە. بەڵام هەواڵ ئەوشتەیە کە جیاواز و نائاساییە. «ژنێك خۆی دەسوتێنێت بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت»، ئەمە هەواڵ نییە چونکە لێرە ئەم رووداوە هەموو رۆژێك دووبارە دەبێتەوە. ئەو شتانەم لە کاتی پراکتیکی خوێندکارەکاندا بە ئاشکرا هەستپێدەکرد، کاتێك رۆژنامەنووسەکان دەستیان کرد بە کاری پراکتیکی، لە یەکێك لە ئیشەکاندا کچە رۆژنامەنووسێك دەربارەی تەقینەوەیەك، کە چەند فاکتێکی تێکەڵ و پێکەڵی تێدابوو، ویستی ستۆرییەك بنووسیت، گرنگترین شت لەو ستۆرییەدا ئەوەبوو کە ژنە رۆژنامەنووسەکە راپۆرتەکەی بە کوشتنی گوێدرێژێك دەستپێکردبوو، لە کاتێکدا لە بارەی کوشتنی سێ کەسەکەوە هیچی نەوتبوو. کاتێك پرسیاری لێکرا بۆچی بەو شێوەیە دەستی پێکردووە، بە کورتی وتی: «تەقینەوە هەموو رۆژێك لێرە خەڵك دەکوژێت، بەڵام کوشتنی گوێدرێژێك بە کەمی روودەدات».

ژنە رۆژنامەنووسێکی تر لە موسڵ پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا کارێکی خراپە چاوپێکەوتنەکانی هەمووی لە رێگەی تەلەفونەوە ئەنجامبدات؟ بەو پێیەی حەزی نەدەکرد ماڵەوە بە جێبهێڵێت، چونکە وێنەکەی لە مزگەوتێکدا هەڵواسرابوو، وەك دیاری کردنێك بە مەبەستی کوشتنی، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی ئەو ژنە رۆژنامەنووس بوو کەواتە پێیان وابوو سیخوڕە. ئەو ژنە لە کۆرسێکی راهێنانی ئێدیتی رادیۆییدا رێکۆردێکی خۆی هێنابوو کە لە ناو تەکسیەکدا تۆماری کردبوو، کاتێك کەوتبووە نێوان تەقەی هێزەکانی ئەمریکا و یاخیبووە عێراقییەکان، ئێمە گوێمان لە هەناسەی بوو لە مایکەکەوە دەنگێکی ناساف و بەرز و نزم کە دیاربوو هەوڵیدەدا بۆ ئەوەی خۆی بخاتە دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکە بۆ سەر زەوی، تاوەکو خۆی لە فیشەکەکان بپارێزێت. ئەم رۆژنامەنووسە کە خاوەنی چوار منداڵ بوو سەرەڕای ئەوەی کە لە هەوڵێکی ناسەرکەوتوو بۆ رفاندنی و بەرکەوتنی فیشەکێك کە بە رێکەوت بەر شوێنی ترسناك نەکەوت، کەچی وازی لە کارەکەی نەهێنا و بەردەوام بوو وەك پەیامنێرێك.

ئەو ژنە ناوی سەحەر ئەلحەیدەری بوو، تەنها ڕێگە بۆ وەستاندنی ئەم ژنە جوامێرە لەکارەکەی بریتیبوو لە کوشتن، ئەوەبوو لە ٢٠٠٧/٦/٧ کوژرا لە لایەن گرووپێکی چەکدار کە چاوەڕێیان کردبوو تا لە ماڵ بێتە دەرەوە لە موسڵ. حەیدەری کەسێکی نایاب و بەهێزو سەربەخۆ بوو، خۆی یەکلایی کردبووەوە بۆ کارەکەی و لە هەمانکاتدا هاوسەرێکی دڵسۆزو دایکێکی خەمخۆری چوار منداڵەکەی بوو. هەر کاتێك سەردانی سەنتەری ڕاهێنانەکەمانی بکردایە لە ئەنیستیتیۆی ڕۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی سلێمانی، دەچووە چێشتخانەکەو خواردنێکی بەلەزەتی بۆ دروستدەکردین. سەحەر حەیدەری دەبوایە بکوژرایە چونکە ڕۆژنامەنووس بوو، ئەو ڕۆژنامەنووسێکی عێراقی بوو کە جورئەتی پرسیارکردنی هەبوو، هەروەك دەنگێکیش بوو کە نەیدەویست وڵاتەکەی شپرزە بێت بە هۆی توندوتیژی تائیفی و وای لێبێت لە لایەن گرووپە تیرۆریستەکانی سەر بە قاعیدەوە حوکم بکرێت.

من پێم خۆش بوو پێشەکی کتێبەکەی فرمان تەرخان بکەم بۆ یادگاری و جوامێرییەکانی ئەو کچە ڕۆژنامەنووسە و هاوپیشەکانی، وەکو یاسین دولەیمی و کەمال ئەنبار و عارف عەلی فلەیەح، سێ ڕۆژنامەنووسی قارەمان بوون کە بەشداریان دەکرد لە کۆرسی ڕاهێنانەکانمان بۆ ئەوەی رایەك ببیستن، بەڵام ئەوانیش بە شێوەیەکی زۆر بێبەهەستانە کوژران، خوێن ڕشتنێك کە هەڕەشە لە هەموو ڕۆژنامەنووسە عێراقییەکان دەکات.

هەرلەو کاتەی دەستمکرد بە کۆرسی ڕاهێنانی ڕۆژنامەگەری لە مانگی ئاداری ٢٠٠٥، چەندین ڕۆژنامەنووسی ئازا و بەجۆشم بینی لەسەرتاسەری عێراق کە پەرۆش بوون بۆ فێربوونی بنەماکانی کاری ڕۆژنامەنووسی، تاوەکو شتێکی جیاواز بۆ کۆمەڵگەکەیان بەرجەستە بکەن. ڕۆژنامەنووس و قوتابییەکان لە ١٨ پارێزگای عێراقەوە لە باشوور و باکوور دەهاتنە سلێمانی بۆ ئەوەی پیشەیەکی نوێ فێربن، لە هەموو کۆرسێکی ڕاهێناندا قوتابییەکان وێنەیەکی دەقاودەقی عێراقیان دەهێنایە ماڵەکەمان، بەشێوەیەك کەم شوێنی عێراق کۆبوونەوەی لەم جۆرەی تێدا دەبینرا.

ژنە ڕۆژنامەنووسێك کە لە بەغداوە هاتبوو بۆ ڕاهێنان، دەیوت «پاش هەر دانیشتنێك لەگەڵ تۆ، هیوام بۆ دێتەوە کەوا عێراقییەکان هێشتا دەتوانن پێکەوە بژین». لەبەرئەوە



کۆرسەکانی ڕاهێنانی ڕۆژنامەنووسان بۆ من تەنها کۆرسی ڕاهێنان نەبوون بەڵکو ئەو کۆرسانە بە شێوەیەك لە شێوەکان بریتیبوو لە ئامانجێکی ئاشتیانە و هەوڵێك بۆ ئاشتکردنەوە و دروستکردنی نەتەوە. لە ڕاستیشدا ڕۆژنامەنووسان دەتوانن ڕۆڵێکی گرنگ ببینن لە سەقامگیرکردنی کۆمەڵگا و گەشەدان بە هەستی یەکگرتوویی و لێپرسراوییەتی.

بە نیسبەت منەوە وەك ڕاهێنەرێك، بینینی ڕۆژنامەنووسانی گەنج و چالاکی وەك فەرمان عەبدولڕەحمان، کە لە پیشەکەیدا بەرەو پێشچوونی بە خۆیەوە دیوە و لێپرسراویەتی لە ڕۆژنامەیەکی نوێدا وەرگرتووە، خۆشییەکی گەورەیە، کاتێکیش زانینم کە هەوڵیداوە بۆ بڵاوکردنەوە و بەخشینی ئەو وانانەی لە کۆرسی ڕاهێنانەکان وەریگرتووە بۆ هاوپیشە گەنجەکانی هاورێیی زیاتر دڵخۆشی کردم. لێرەدا هیوادارم زۆرێك لە ڕۆژنامەنووسان بە تایبەتی ئەوانەی کە خوازیاری فێربوونن کتێبەکەی فرمان بخوێننەوە و ئاشنا بن بە بنەماکانی ڕۆژنامەگەرییەکی بەرپرسیارو باش.

بە ڕاستیش ڕۆژنامەگەری کاری خزمەتکردنە بە کۆمەڵگە، لەبەرئەوە پێویست ناکات هیچ کەس نە سیاسییەکان و نە لێپرسراوەکان و تەنانەت هاوڵاتییەکی ئاسایی، ڕۆژنامەنووس بە دوژمنی خۆی بزانێت، لەلایەکی دیکەوە دەبێت ڕۆژنامەنووسانیش ئەوە بزانن کە لێپرسراوییەتییەکی گەورەیان لەسەر شانە و پێویستە ڕاستگۆ و وردبین و باوەڕپێکراوبن، هەروەك هیچ کات نابێت بە دوای ئەجێندای سیاسی خۆیانەوە بن، لە ژینگەیەك کە متمانەو ڕێزی دوولایەنە هەبوو هەموو کەس لە میدیاییەکی ئازاد و سەربەخۆ سوودمەند دەبێت.

**سوزانا فیشەر**
**بەڕێوەبەری پرۆگرامی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی IWPR**
**سلێمانی - ٢٠٠٨/٣/٢٦**

# پێشەکیی نووسەر

لە دوای رووخانی رژێمی سەدام حوسێن لە ۲۰۰۳دا ئەنیستیتیۆی رۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی iwpr وەکو رێکخراوێکی ناحکوومی قازانج نەویست کە کارەکانی تایبەتە بە پەرەپێدانی رۆژنامەگەری لۆکاڵی لەو وڵاتانەدا کە بە قۆناغی دوای جەنگدا تێپەردەبن، هاتە عێراقەوە و دەستیکرد بە راهێنانی رۆژنامەنووسانی عێراقی بە کورد عەرەب و نەتەوەکانی دیکەوە، ماگی زاگنەر کچە رۆژنامەنووسی ئەمریکی وەکو یەکەم راهێنەر لە سلێمانی چەند کۆرسێکی راهێنانی رۆژنامەنووسی ئەنجامدا، لە یادمە لە یەکێك لە دانیشتنە ئاساییەکانی دوای راهێنانەکان رۆژنامەنووسێکی بەشداربووی ئەو کۆرسە پرسیارێکی لەو راهێنەرە کرد و وتی: "ئایا ئەو شێوە راپۆرتکردنەی کە تەنها بریتییە لە وتەی چەند کەسێك و لە فۆرمی وتەی دایە، لە کەیەوە لە رۆژنامەگەری خۆرئاوادا بەسەر چووە و باوی نەماوە؟"، وەڵامەکەی ماگی سادە بوو بەڵام بارگاوی بە شۆکێکی گەورە بۆ ئێمە، ماگی لە وەڵامی پرسیاری ئەو کچە رۆژنامەنووسەدا وتی: «ببوورە ئەو شێوە راپۆرتکردنەی ئێوە پەیڕەویتان لێ کردووە بوونی هەر نەبووە تا بەسەر بچێت».

لە دوای راپەڕینەکەی بەهاری ۱۹۹۱ کۆمەڵێك رۆژنامەی حیزبی دەرچوون و فۆرمێکی واقیعییان بەرجەستەکرد، کە ناکرێت رۆڵیان لە دروستکردن و ئەکتیڤکردنی بزاڤی رۆژنامەگەری کوردی فەرامۆش بکرێت، کە ئەوەیان باسێکی ترەو پێویستی بە توێژینەوەیەکی مێژوویی هەیە، بەڵام بەو پێیەی کە تەنها پشتی بە توانایەکی زاتی و ئەزموون و پسپۆرییەکی لۆکاڵی بەستبوو روخسار و سیمایەکی تایبەتی وەرگرت و ژانرە جیاوازەکانی کاری رۆژنامەگەری لە نێو رۆژنامەگەری کوردیدا بەرمەبنای ئەو ئەزموونە تاکە کەسی و لۆکاڵییانە سیستماتیك کران، هەربۆیە هیچ نەنگییەکی تێدا نییە گەر بڵێین کە تا ئاستێکی کەم توانیبووی



هاوتەریب لەگەڵ پرەنسیپە نێودەوڵەتییەکانی کاری رۆژنامەگەری رێ بکات، لە دوای روخانی رژێمی سەدام حسێن و هاتنی کۆمەڵە رێکخراوێکی نێودەوڵەتی وەکو iwpr و هاوشێوەکانی قۆناغێکی تا رادەیەك نوێیان لە نێو رۆژنامەگەری کوردیدا دروستکرد، سەلماندنی ئەم بڕوایە وەکو راستییەك بەجێدەهێڵم بۆ لێکۆڵیارێکی بواری مێژووی رۆژنامەگەری کە بە ویژدانەوە حوکم لەسەر بارودۆخەکە بدات.

بەش بەحاڵی خۆم کە لە ساڵی ۱۹۹۹وە کاری رۆژنامەگەری دەکەم تا هاتنی iwprو بینینی چەند کۆرسێك تەنها پشتم بە توانا و خیبرەیەکی زۆر لۆکاڵی و شەخسی بەستبوو، بەڵام دوای ئەوەی لە ساڵی ۲۰۰٤ یەکەم کۆرسی راهێنانم دەربارەی بنەما نێودەوڵەتییەکانی کاری رۆژنامەگەری بینی تێگەیشتم کاری رۆژنامەگەری پابەندی چەندین ستاندارد و پرەنسیپ و رەگەزی زانستی و پیشەییە، ئەو کۆرسە رۆژنامەنووسێکی ئەمریکی بە ناوی لاورا ئەنگلز پێی وتین، ساڵی ۲۰۰۵ دووەم کۆرسی رۆژنامەوانیم لە هەمان پەیمانگا بینی کە بریتی بوو لە کۆرسێکی رۆژنامەوانی ئابووری کە کچە رۆژنامەنووسی ئەمریکی تیاری راس پێی دەوتینەوە، ساڵی ۲۰۰٦ سێیەم کۆرسم وەرگرت کە تایبەت بوو بە چۆنێتی نووسینی گۆشە و وتاری بیروڕاو نووسینی سەروتاری رۆژنامە، ئەمجارە خاتوونێکی رۆژنامەنووسی ئەڵمانی بوو بە ناوی سۆزانا فیشەر، کە پێشەکی ئەم کتێبەشی نووسیوە، ساڵی ۲۰۰۷ چوارەم کۆرسی رۆژنامەوانیم وەرگرت کە تایبەت بوو بە رۆژنامەگەری تەحقیقی لەسەر دەستی کریستۆڤەر رۆیتەر پەیامنێری گۆڤاری (شتێغن)ی ئەڵمانی. تاکە بەشدار لەو کۆرسانەدا من نەبووم بەڵکو کۆمەڵێك رۆژنامەنووسی کوڕ و کچ بووین کە دواتر گەڕاینەوە بۆ دەزگاکانمان دونیابینی رۆژنامەوانیمان تا سەر ئێسقان گۆڕابوو، هەموو ئەوانەی بەشداریمان لەو کۆرسانەدا کرد شێوازی کارکردن و داڕشتنەوەی بابەتە رۆژنامەوانییەکانمان گۆڕی، بەشێك لەو بۆچوونە نوێیانەی وەرمانگرت توانیمان لە کاری ئەو رۆژنامانەشدا بەرجەستەی بکەین کە کارمان تێیاندا دەکرد.

جگە لەوەش شێوازی وەرگرتنی کۆرسی راهێنان لە iwpr بەشێوەیەك بوو کە ناچاری دەکردی چەند راپۆرتێك بۆ پەیمانگاکە بکەیت، کە دواتر موحەریرە بیانییەکانی پەیمانگاکە راپۆرتەکانییان تەحریر دەکردو لە وێبسایتەکەی خۆیان بڵاویان دەکردەوە کە ئەوەش بۆ هەموو بەشداربووان ئەزموونێکی دەوڵەمەندی پێدەبەخشی ئەمە جگە لەو موحازەرانەی دی کە جارجارە رۆژنامەنووسە بیانییەکان لە کاتی سەردانییاندا بۆ سلێمانی پێیاندەوتینەوە، سەرەڕای ئەوانەش ئەو سەرنج و تێبینییە رۆژنامەنوسییە زێڕینانەی لە نێو کۆرسەکاندا تۆمارمان دەکرد، لە هەموو ئەوانەش گرنگتر بۆ هەر کۆرسێك راهێنەرە بیانییەکە کوڕاسەیەکی تایبەت بە بواری کۆرسەکەی پێدەبەخشین، کە بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدرابوو، هەموو ئەوانە سەرمایەیەکی مەعنەوی و پڕ بایەخ بوون بۆ ئێمە.

ئەم کتێبە بەرهەمی ئەو کۆرسانەیە کە لەسەر دەستی رۆژنامەنوس و مامۆستا بیانییە دڵسۆزەکانم لە iwpr وەرمگرتوون، بە تایبەت هەر چوار رۆژنامەنووس و راهێنەری پرۆفیشناڵ (لاورا ئەنگلز، تیاری راس، سۆزانا فیشەرو کریستۆف رۆیتەر) کە پێمخۆشە وەك خۆی ئاماژە بکەم بە ناوی کۆرسەکانییان (مبادئ و الصحافة الدولية، الصحافة الاقتصادية، مقالات الرأي و كيفية كتابة الافتتاحيات، الصحافة التحقيقيه)، هەر بۆ پاراستنی ئەمانەت و راستگۆیی پێویستە بڵێم کە بەشێکی زۆری ئەم کتێبە لەو کۆراسانە وەرمگرتوون کە ئەو چوار راهێنەرە نێودەوڵەتییە بۆ کۆرسەکانیان ئامادەیان کردبوو، لەگەڵ لێکدانەوە و دووبارە داڕشتنەوە و شیکارکردنی ئەو زانیارییە سەرەکییانەی کە لەو هاندبوکانەدا ئاماژەیان بۆ کراوە، ئەمە جگە لەو تێبینیو سەرنج و خاڵە گرنگانەی لە میانەی گفتوگۆکان و ئەنجامدانی کاری مەیدانی لای خۆم تۆمارم کردبوون.

لە لایەکی دیکەوە لە مانگی ئەپریلی ٢٠٠٧دا لە (مركز الجزيره الاعلامي للتدريب والتگوير) لە شاری دۆحەی پایتەختی قەتەر کۆرسێکی رۆژنامەوانیم بینی لەسەر دەستی رەسڵ ئایزاك، کە راهێنەرێکی نێودەوڵەتی دامەزراوەی تۆمسۆنی



بەریتانییە، ئەو کۆرسە کە نزیکەی مانگێکی خایاند ئەزمونێکی دیکە بوو کە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبە بەرهەمی ئەو هاندبوکانەیە کە لەو دامەزراوەیە پێماندرا بە تایبەتی یەکێکیان بە ناوی (مهارات فی التعامل مع وسائل الاعلام)، هەربۆیە زۆر بە راشکاوی دەیڵێم بۆ نووسینی ئەم کتێبە جگە لەو کوڕاسەو هاندبوکانەو کتێبێکی رۆژنامەنووسی ئەمریکی دێبرا پۆتەر بە ناوی (رێبەری رۆژنامەنووسی سەربەخۆ)، پشتم بە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نەبەستووە. هەروەك لێرەدا بە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی هەر چوار مامۆستاو راهێنەری دڵسۆزم (لاورا ئەنگلز، تیاری راس، سۆزانا فیشەر و کریستۆف رۆیتەر) بکەم، کە هەمیشە خۆم بە قەرزارباریيان دەزانم. هەروەها ناکرێت رۆڵی کارمەندە کوردەکانی دیکەی ئەنستیتیۆی رۆژنامەوانی جەنگو ئاشتی فەرامۆش بکەین کە دڵسۆزانە بەشدارییان کردووە لە ئاسانکاری بەڕێوەچوونی کۆرسەکان.

بە پێویستم زانی ناونیشانی (ستۆری) بۆ ئەم کتێبە هەڵبژێرم، بەوپێیەی ئەم ژانرە رۆژنامەوانییە ئێستا لە رۆژنامەگەری خۆرئاوا پێگەیەکی گرنگی هەیە و لە کارە سەرەکییەکانیی رۆژنامەنووسە مەیدانییەکانن، هەڵبژاردنی ناونیشانی (ستۆری) بۆ ئەم کتێبە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە وەرگێڕانی چەمکی ستۆری ئینگلیزی بۆ کوردی بە واتای چیرۆك ئەوەندەی مانایەکی ئەدەبی دەبەخشێت ئەوەندە مانایەکی رۆژنامەوانی نابێت، چونکە سیستمی وێناکردن بۆ ئەو چەمکە لە کەلتوری کوردیدا زیاتر رەهەندێکی ئەدەبی هەیە نەك رۆژنامەوانی، هەرچەندە لە رۆژنامەگەری کوردیدا زۆرجار شتێکمان بەرگوێ دەکەوێت بە ناوی (چیرۆکە هەواڵ) کە ئەمەیان داهێنانێکی کوردییە و ئەم کتێبە نە لە نزیك و نە لە دوور پەیوەندی بەو باسەوە نییە و بە هیچ شێوەیەکیش مەبەستمان لە ستۆری (چیرۆکە هەواڵ) نییە. بەڵام لە راستیدا لە کەلتووری رۆژنامەوانی خۆرئاوادا ستۆری شێوەیەکی راپۆرتکردنە کە پشت بە چەند ستاندارد و رەگەز و بنەمایەکی زانستی دەبەستێت و چەندین ستایڵی

جیاواز دیاریکراوە بۆ نووسینی ستۆری و لە زانکۆ موعتەبەرەکانی جیهاندا وەك بەشێکی گرنگ لە وانەکانی راگەیاندن دەخوێنرێت.

هەرچەندە ماوەی زیاتر لە ساڵێکە سەرقاڵی ئامادەکرن و نووسینی ئەم کتێبەم، کە پێموایە رێبەرێکی تیۆری و پراکتیکی گرنگ دەبێت بۆ ئەو کەسانەی دەخوازن زیاتر پرۆفیشناڵانە لە بواری رۆژنامەوانی کاربکەن، هەروەك سەرچاوەیەکی گرنگیش دەبێت بۆ خوێندکاران و فێرخوازانی خوێندنی راگەیاندن لە زانکۆ و پەیمانگاکانی کوردستان، لەگەڵ ئەوەشدا گومانم نییە کە هیچ بەرهەمێك بێ هەڵە و کەم و کوڕی نابێت، هیوادارم توانیبێتم پشکێکی بچووکم سەربار کردبێ بۆ کەلتووری هەژاریی رۆژنامەگەری کوردی.

**فرمان عەبدولڕەحمان**
**سلێمانی ٢٠٠٨/٦/١**



## رۆڵی رۆژنامەنووس لە کۆمەڵگادا

مومکین نییە قسەکردن لە کۆمەڵگەیەکی کراوە و مەدەنی، ئەگەر بنەما راستەقینەکانی دیموکراسیەت لە نێو سەرجەم کایە جیاوازەکانیدا بەرجەستە نەبووبێت. قسەکردنیش لە دیموکراسیەت بەبێ بەخشینەوەی قورسایی بە گرووپ و هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگا و بەهەند وەرگرتنی بڕیار و دنیابینییەکانی شەقام، وەهمێکی گەورەیە.

زۆرجار رۆژنامەگەری ئازاد بە ئۆکسجینی دیموکراتی وەسفدەکرێت، بەو پێیەی هیچ کامیان بەبێ ئەوی دی ناتوانێت بوونی خۆی بەرجەستە بکات. بیریاری فەرەنسی ئەلیکسس دی تۆکۆفیل پێش ٢٠٠ ساڵ کە سەردانی ئەمریکای کرد، نووسی «رۆژنامەگەری راستەقینە بەبێ دیموکراتیەت نابێت، دیموکراتیەتیش بە بێ رۆژنامەگەری نابێت».

هەروەك دیموکراسیەتیش پشت بە رەزامەندی هاوڵاتییان دەبەستێت کە ئاگاداری سیاسەتەکانی حکوومەتن، کەناڵەکانی راگەیاندنیش سەرچاوەی سەرەکی ئەو زانیارییانەن کە هاوڵاتییان پێویستیانە بۆ ئەوەی حوکمی خۆیان بکەن.

بەڵام دیموکراسیەت تەنها پرۆسەیەکی دروشم ئامێزی سەر کاغەز و نێو گوتارەکان نییە، بەڵکو تۆڕێکی گشتگیر و هەمەلایەنەیە لە چالاکی و پەیوەندی و رایەڵەکردن. لە سیماهەرە جەوهەرییەکانی ئەم سیستمە. پێشنیگابوونی قورسایی هێز و گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیە لە بڕیاردان و کاریگەری لەسەر ئەو روداو و پرۆسە چارەنووسسازانەدا کە پەیوەندی بە ژیان و ئایندەیانەوە هەیە.

هێزی کۆمەڵگەش ناتوانێ لە نێو چوارچێوەیەکی عەقڵانیدا بەرجەستە بێت تا ئەوەی رای گشتی سەبارەت بە رووداوەکان بەرهەمبهێنێت، ئەگەر هۆشیاری تاك و گرووپەکان نەگەیشتبێتە ئاستێکی باڵا لە زانیاری گرنگ و بابەتی دەربارەی

وردەكارییەكانی ئەو شتانەی كە لە كۆمەڵگەدا روودەدەن، چونكە هەمیشە دەسەڵاتی سیاسی دەخوازێت زانیارییــە گرنگــەكان لــە هاوڵاتیــان بــشارێتەوە بــە تایبــەتی لــە كۆمەڵگە داخراوەكاندا.

زۆربەی دەوڵەتان میكانیزمی پاراستنی یاساییان بۆ كاری رۆژنامەنووســی ئــازاد داناوە تاوەكو رۆژنامەنووسان بتوانن بە ئاسانی زانیارییەكان بۆ هاوڵاتیان بگوازنەوە. بۆ نموونە لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئــەمریكا رۆژنامەگــەری یەكــەم پیــشەیە كــە لــە دەستووری ئەمریكیدا ئاماژەی بۆ كراوە و دەڵێت: «نابێت كۆنگرێس هــیچ یاســایەك دابنێت .... كە ئــازادی قــسەكردن و رۆژنامەگــەری ســنووردار بكــات». هــەروەها تۆماس جیفەرسۆن سێهەم سەرۆكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ساڵی ١٧٨٧دا وتی "بەو پێیەی ئەو بنەما سەرەكییەی كە حكوومەتەكەمانی لەسەر بینــاكراوە رای خەڵكییە، لەبەرئەوە ئامانجی یەكەم پێویستە چاكسازی ئەو مافە بێــت، ئەگــەر مــن سەرپشك كرام لە هەڵبژاردنی حكوومەتێكی بێ رۆژنامەگەری یان رۆژنامەگــەری بــێ حكوومەت، ئەوا بێ دوودڵی ئەوەی دووهەم هەڵدەبژێرم".

لێرەدا رۆڵ و ئەركی هەستیاری رۆژنامەنووس خــۆی نمــایش دەكــات، بــەوەی كــە گرنگترین كاراكتەرە بۆ دەرخستن و گەیاندن و دۆزینەوەی زانیارییە شاردراوە گرنگ و راســتەقینەكان، هەربۆیــە وەڵامدانــەوەی پرســیاری ئــەوەی كــە ئایــا ئــەرك و رۆڵــی رۆژنامەنووس چییە لە كۆمەڵگــەدا؟ ئەگــەری كردنــەوەی چــەندین دەروازە لەبــەردەم رۆژنامەنووسدا دەكاتەوە تا زیاتر بەرەو ئامانجەكانی هەنگاو بنێت و هاوتەریب لەگەڵ ستانداردە نێودەوڵەتییەكانی كارەكەیدا بڕوات.

دێــبرا پۆتــەر رۆژنامەنووســی ئــەمریكی لــە كتێبــی (رێبــەری رۆژنامەنووســی ســەربەخۆ) دەڵێــت «رۆژنامەنووســان لــە كۆمەڵگــە دیموكراتەكانــدا تــەنها خــاوەنی حەسانەی كاركردن نین، بەڵكو كۆمەڵێك بەرپرســیاری گرنگیــان لــە ئەســتۆدایە، كــە ئەویش ئاشكراكردن و گەیاندنی زانیارییە شاراوەكانن بۆ هاوڵاتییان بە شێوەیەكی بێ لایەن و نەزیهانە، بۆ ئەوەی ببنە هاوڵاتییەكی تێگەیشتوو».

هەروەها فینلی پیتەردان نووسەری ئەمریکی تەنزئامێز لە سەدەی نۆزدەدا نووسیویەتی ئەرکی ڕۆژنامەنووس بریتییە لە «هاوخەمی کردنی لیقەوماو و ئازاردانی مورتاحەکان».

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسان لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا هەر هەمان ڕۆڵەو گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە. کاتێك کە «لیژنەی ڕۆژنامەگەری بۆ کاروباری پرۆفیشناڵی»، کە بریتین لە گرووپێك و بارەگای سەرەکییان لە واشنتۆنە، لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ڕاپرسییەکی لە نێو ڕۆژنامەنووساندا ئەنجامدا بۆ زانینی بیروڕایان سەبارەت بە سروشتی پیشەکەیان، لە ئەنجامدا گەیشتە دیدێکی هاوبەش کە خاڵی سەرەکی و کۆکەرەوەی هەموو ڕۆژنامەنووسە بەشداربووەکان بوو، کە بریتی بوو لە «ئامانجی سەرەکی ڕۆژنامەگەری بریتییە لە گەیاندنی زانیاری ورد و بڕواپێکراو بۆ هاوڵاتییان کە پێویستییان پێیەتی بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆیان بگێڕن لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراتدا».

لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کاری ڕۆژنامەنووسیدا هاتووە بەڵام هەر خاوەنی هەمان جەوهەری نەگۆڕی خۆیەتی سەبارەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ هاوکێشە جیاوازەکانی سیاسەت و کۆمەڵگە. بیلّ کۆفاك و تۆم ڕۆزینستیل لە کتێبەکەیاندا بە ناوی (بنەماکانی ڕۆژنامەگەری: ئەوەی ڕۆژنامەنووسان پێویستە بیزانن و ئەوەی خەڵکیش پێویستە چاوەڕێی بکەن)، دەڵێن «کۆمەڵێك بنەمای ئاشکرا هەن کە ڕۆژنامەنووسان هاوڕان لەسەری و مافی هاوڵاتیانیشە چاوەڕێ و پێشبینی ئەوە بکەن، لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا». هەندێ لەو بنەمایانەش بریتین لە:

- ئیلتیزامی یەکەمی ڕۆژنامەنووس بریتییە لە ڕاستی.
- ئینتیمای یەکەمی بۆ هاوڵاتییانە.
- کرۆکی کارەکەی بریتییە لە لێکۆڵینەوە و سەلماندن.
- پێویستە سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن لەو مەسەلانەی ڕوومالّی دەکەن.



- ڕۆژنامەنووس دەبێت ڕۆڵی چاودێرێکی سەربەخۆ ببینێت بۆ چاودێریکردنی دەسەڵات.
- پێویستە مینبەرێك بۆ ڕەخنەی گشتی و چارەسەری گونجا و فەراهەم بکات.
- پێویستە ڕۆژنامەنووس حوکمی ویژدانی خۆی بکات.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بەگشتی ڕۆڵی ڕۆژنامەنووس لە کۆمەڵگادا لە چوارخاڵی سەرەکیدا بەرجەستە دەبێت :

## یەکەم: ئاگادار کردنەوە و هۆشیار کردنەوەی هاوڵاتیان

نەبوونی شەفافیەت لە کۆمەڵگە داخراوەکاندا وایکردووە زۆربەی پرۆسە سیاسییەکان و ئەو بڕیارە چارەنووسسازانەی پەیوەندییەکی ئۆرگانیکیان بە ژیانی کۆمەڵگە و هاوڵاتیانەوە هەیە، لە نێو ژوورە داخراو و دەهلیزە نهێنییەکاندا بەڕێوە بچێت، کە زۆرجار هاوڵاتیان دەستیان ڕاناگات بە زانیارییەکان. لەبەرئەوە ئەرکی گرنگو سەرەکی ڕۆژنامەنووس ئەوەیە هاوڵاتیان لە زانیاری ڕاستەقینە ئاگادار بکاتەوە و بەرامبەر هەر کاردانەوەیەکی دەسەڵاتی سیاسی هۆشیاری بداتە ئەو هاوڵاتیانەی کە بواری تێگەیشتن و زانینی دەرەنجام و کاریگەری ڕوداو و گۆڕانکاریەکانیان نییە.

## دووەم: پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی ڕاست و ورد و هاوسەنگ

ڕۆژنامەنووس بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی بابەتیانە خاڵی یەکەم تەواو بکات و ئەو هۆشیارییە لە نێو هاوڵاتیاندا بەرجەستە بکات، پێویستە ڕاپۆرتی ورد و هاوسەنگ پێشکەش بە هاونیشتمانییەکانی بکات، بەشێوەیەك لەو دیو سنوورەکانی ئایدۆلۆژیاوە کارەکانی سیستماتیزە بکات. بە واتایەکی دیکە ڕۆژنامەنووس دەبێت بە چاك بڵێت چاك و بە خراپیش بڵێت خراپ.

رۆژنامەنووس تەنها گوێزەرەوەی زانیاری و بیروڕا جیاوازەکان نییە بەڵکو فیلتەرێکی گرنگە بۆ جیاکردنەوەی راستی لە پروپاگەندە و زانیاری لەگەڵ بیروڕا. بیل کیلەر موحەریری جێبەجێکار لە رۆژنامەی نیویۆرك تایمز دەڵێت «بەرپرسیارێتییە سەرەکییەکانی رۆژنامەنووس بریتییە لە حوکمدان لەسەر زانیارییەکان».

لێرەدا خاڵێکی ئاشکراو هەستیار لە کاری رۆژنامەنووسیدا راماندەوەستێنێت، ئەویش ئەوەیە کە تەنها کار و دواهەمین ئامانجی رۆژنامەنووس (سەبقی خەبەری) نییە، بەڵکو لەهەمانکاتدا گەیاندنی ئەو زانیاریانەشە بەشێوەیەکی بابەتیانە و میسداقیەتئامێز، چونکە فریودان و رۆنینەوەی زانیاری بێ بنەما ناتوانێت دەستی گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بگرێت بۆ هۆشیارکردنەوە و ئاگادار کردنەوەیان لەو گۆڕانکاری و رووداوانەی کە لەنێو ئەو رووبەرە جیۆگرافیەدا روودەدات کە رۆژنامەنووس روماڵی دەکات، ئەوەش لە سادەترین و ترسناکترین دەرەنجامیدا رێگەی دروستکردنی رای گشتی درێژ و پڕ کێشە دەکات. رای گشتیش ئەو بوونیادە گرنگەیە کە ژێرخان و سەرخانی دیموکراسیەت لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا رادەگرێت.

## سێیەم: روونکردنەوەی ئاکامی گرنگ و مومکین

بەهۆی سەرقاڵی بەشی هەرە زۆری هاوڵاتیان بە ژیانی رۆژانە و کاروبارە رۆتینئامێزەکانەوە ناتوانن ئاگاداری هەموو گۆڕانکاری و جموجوڵ و رووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بن، یاخود دەسەڵات بەمەبەست دەیەوێت شوناسێکی جیاواز و وێنەیەکی ماکیاژکراو بە هەڵسوکەوت و بڕیارو پرۆسەکانی خۆی ببەخشێت و بەو شێوەیە وێنای بکات کە خۆی دەیخوازێت، لەم سەروبەندەشدا کاریگەریە راستەقینەکانی رووداوەکان نارۆشنانە دەخەملێن، لەبەرئەوە ئەرکی رۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵە لە رێگەی کارە رۆژنامەوانییەکانی ئاکام و پێشهاتە گرنگ و چاوەڕوانکراوەکان بۆ هاوڵاتیان بەیان بکات. بە تایبەتی لە کۆمەڵگە ئینتیقالییەکاندا کەم جار رێکدەکەوێت خواستی دەستەجەمعی کۆمەڵگەیەك لەگەڵ نوخبەی سیاسیدا یەکبگرێتەوە بەتایبەتی لەو پانتاییانەدا کە پەیوەندی بە هێنانەدی دادپەروەری کۆمەڵایەتییەوە هەیە.



## چوارەم: کارکردن وەك کەناڵێکی پەیوەندی

پێویستە رۆژنامەنووس چاوێکی کراوەی ئەو مرۆڤانە بێت کە خزمەتگوزارییەکانی خۆیانی پێشکەش دەکات، چونکە رۆژنامەنووس تاکە کاراکتەرە کە تەماسێکی راستەوخۆی لەگەڵ پرۆسەی گواستنەوەی زانیارییەکاندا هەیە. بە واتایەکی دیکە رۆژنامەنووس لە کارکردنیدا لەم چالاکییە هەستیارەدا پێویستە کەناڵێکی پەیوەندی و مەڵتی پەیوەندی بێت لە نێوان هاوڵاتیان و بەرپرسانی دامەزراوەکانی دەوڵەتدا.

بەهەمان شێوە دەبێت رۆژنامەنووس توانای رۆچون و چوونە نێو هەموو خانەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە و بچووکی کۆمەڵگەی هەبێت و لە هەمانکاتیشدا توانای دروستکردنی رایەڵەی جیاوازی هەبێت لەگەڵ دامەزراوەکانی دەوڵەتدا بۆ ئەوەی ئەگەری ئاسان گواستنەوەی زانیارییەکان مسۆگەر بکات.

## پێنجەم: مسۆگەر کردنی ئەوەی کەسانی زۆر گرنگ (VIP) لێپرسراوێتیان لە ئەستۆدایە

لە کۆمەڵگەدا وەکو چۆن هەموو کەسێك مافی هەیە بە هەمان شێوە هەموو کەسێکیش بە پێی ئەو پێگە کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیریەی هەیەتی جۆرێك لە ئەرك و لێپرسراوێتی لە ئەستۆیدایە. ئەوەی مەبەستە و جێگەی هەڵوێست کردنە، چاودێریکردنی هەڵسوکەوت و مامەڵەی بەرپرسانی حکوومەتە لە کۆمەڵگەدا بەرامبەر ئەو لێپرسراوێتییەی هەیانە، ئەرکی رۆژنامەنووسە لە رێگەی خزمەتگوزارییەکانییەوە ئەو راستییە تۆخبکاتەوە کە کەسانی زۆر گرنگی کۆمەڵگە هەر لەرۆشنبیر و بازرگان و تەکنۆکراتێکەوە هەتاوەکو بەرزترین ئاستی دەسەڵاتی سیاسی ئەرك و لێپرسراوێتیان گرنگتر و هەستیارترە، ئەمەش لە سادەترین مانایدا ئەوە نیشاندەدات کە بەرپرسان و دەسەڵاتداران ئەرکێکی زیاتر و گرنگتریان لە

ئەستۆدایە و هەر هەڵسوكەوت و بڕیاردانێكیان ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر كۆمەڵگە، بۆیە ڕۆژنامەنووس دەبێت ئەو حەقیقەتە بسەلمێنێت كە كەسانی گرنگی كۆمەڵگە لێپرسراوێتی ئەخلاقی و مێژوییان لە ئەستۆدایە و پێویستە بەو هەست و دنیابینییەوە مامەڵە لەگەڵ دەسەڵاتەكانیاندا بكەن.

## هەواڵ

هەواڵ یەكێكە لەو خزمەتگوزارییە سەرەكی و بنەڕەتیانەی كە ڕۆژنامەنووس پێشكەشی دەكات لە ڕێگەی هۆكارە جیاوازەكانی ڕاگەیاندنەوە، چەند چوارچێوەیەكی گرنگ هەیە بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ڕوداوە هەواڵئامێزەكاندا، كە بەهۆیەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە هەواڵ چییە؟

**یەكەم: هەواڵ بریتییە لەو زانیارییەی كە خەڵك پێویستیەتی تاكو ببنە هاوڵاتی تێگەیشتوو**

لە كۆمەڵگە ڕاگوزەرەكاندا هەمیشە فاكتەری شەفافییەت یەكێكە لە شتە بزربووەكان، هەربۆیە هاوڵاتی ئاسایی دواهەمین كاراكتەرن كە زانیارییەكانیان پێدەگات، یاخود هەر ناگات. بەتایبەتی ئەو زانیارییانەی كە پێویستن هەموو كەسێك بیزانێت بۆئەوەی بتوانن لە بارەی گۆڕانكاری و پێشهاتە جیاوازەكانەوە بڕیار لە چارەنووس و ئایندەی خۆیان بدەن. لێرەوە هەر زانیارییەك كە هۆشیاری هاوڵاتیان فراوان بكات و ئاسۆی دنیابینیان بكاتەوە دەبێتە كەرەستەیەكی گرنگی هەواڵ.

بۆ نموونە : هاوڵاتیان ناتوانن بە شێوەیەكی ڕاستەقینە و دیموكراسی گوزارشت لە بیروڕای خۆیان بكەن لە پرۆسەی ڕیفراندۆمدا بۆ پشتگیری یاخود ڕەتكردنەوەی دەستووری وڵات، ئەگەر زانیاری تەواویان لەسەر خودی دەستوور نەبێت. لێرەدا گەیاندن و دەرخستنی هەر زانیارییەك لەبارەی دەستووری وڵاتەوە، ئەوا دەبێتە هەواڵێكی گرنگ و كاریگەر.



**دووەم: هەواڵ بریتییە لە تۆمارێكی پەیوەندییە گۆڕاوەكان، واتە تۆماری ئەو ڕووداوانەیە كە دەبنە مایەی شێواندنی باری نەگۆڕ و جێگیر.**

هەموو پرۆسەیەكی گۆڕانئامێز كە توانای شێواندنی باری ئاسایی و دۆخە جێگیرەكانی كۆمەڵگەی هەبێت خۆی لە خۆیدا كەرەستەیەكی گرنگی هەواڵە. بە واتایەكی دیكە بوونی تۆخمی نوێ لە ڕوداوەكاندا هەڵگری ڕەگەزەكانی هەواڵن، چونكە هەر گۆڕانێك لە هاوكێشە و كایە جیاوەزەكانی وڵاتدا كاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر هاونیشتمانیان دەبێت، هەربۆیە خەڵك ئارەزوی زانینی دەكەن. لێرەوە هەواڵ تۆمارێكی گشتی ئەو ڕوداوانەیە كە بەهۆی گۆڕانەكانەوە دێنە بوون و شتانێكی نائاشنان و هەڵگری ڕوخسارێكی تازەن. بۆ نموونە: گۆڕینی دراوی وڵات، پاسپۆرت، سیستمی پەروەردە و پرۆگرامی خوێندن.

**سێیەم: هەواڵ بریتییە لە ڕووداوێك كە كاریگەری دەبێت لەسەر كۆمەڵگە**

هەر ڕووداوێك یاخود بڕیار و پرۆسەیەك كاریگەری لەسەر كۆمەڵگە دروستبكات دەبێتە (هەواڵ)، ئیدی ئەو كاریگەرییە باش بێت یان خراپ، چونكە هاوڵاتیان مەحكومن بە ژیان لە نێو كۆمەڵگەدا وەكو یەكەیەكی ئۆرگانیكی. لەبەر ئەوە كاردانەوە و كاریگەری هەر گۆڕانكاری و ڕوداوێكی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی، بەشێوەیەكی خودئاگایی بێت یان ناخودئاگایی، كاریگەری دەبێت لەسەر هاوڵاتیان. كەواتە هەموو ئەو ڕوداوانەی كاریگەری لەسەر كۆمەڵگە بەجێدەهێڵن بە هەر دوو ئاراستەكەیەوە چ باش بن یان خراپ كەرەستەیەكی گرنگن بۆ هەواڵ. بۆ نموونە: زیاد كردن یان كەمكردنی مووچە، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئایدز یان ئەنفلۆنزای باڵندە، جێبەجێكردنی ڕاپۆرتەكەی بیكەر — هاملتۆن. هاتنی هێزێكی ئیقلیمی بۆ كوردستان.

## بەهاكانی هەواڵ:

بەدەر لەو چوارچێوە گشتیانەی پێشتر وەك ستانداردێك بۆ مامەڵە كردن لەگەڵ رواوی هەواڵئامێز ئاماژەمان بۆ كردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كۆمەڵێك رەگەز و بەهای دیكە هەن كە گرنگی و كاریگەربوونی هەواڵ بەرجەستە دەكەن، هەرچەندە لە هەر دەزگا و هۆكارێكی راگەیاندندا رۆژنامەنووس و سەرنووسەرەكان بڕیار دەدەن كە كام رووداوە بەهای بوون بە هەواڵی تێدایە و شایستەی ئەوەیە وەكو هەواڵ تۆمار بكرێت و بڵاوبكرێتەوە. بەڵام رۆژنامەنووسە پرۆفیشناڵ و نێودەوڵەتییەكان هەمیشە لە سۆنگەی ئەم رەگەز و بەهایانەی خوارەوە تەماشای قورسایی و كاریگەرێتی رووداوەكان دەكەن، تا بڕیار لەسەر شایستەبوونی رووداوەكە بدەن كە ئایا بەهای هەواڵی هەیە یاخود بە پێچەوانەوە. بەها نێودەوڵەتییەكانی هەواڵ بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

### ١. ململانێ:

رەگەزی ململانێ یاخود توندوتیژی و گرژی و ئاڵۆزی لە هەر رواوێكدا هەبێت بەهای بوون بە هەواڵی هەیە و شایستەی ئەوەیە بڵاوبكرێتەوە. بۆ نموونە بۆردومانكردنی گوندەكانی سەر سنوور لەلایەن هێزەكانی ئێرانەوە، بارگرژی نێوان كورد و توركمان لە كەركوك.

### ٢. بەرەو پێشچوون و گۆڕانكاری:

هەر رووداوێك رەگەزی دەستكەوت یان سەركەوتن یاخود گۆڕانكاری بوونیادنەرانەی تێدا بێت بەهای بوون بەهەواڵ مسۆگەر دەكات. بۆ نموونە چارەسەركردنی قەیرانی كارەبا یان سووتەمەنی، كردنەوەی زانكۆی ئەمریكی لە كوردستان.



### ٣. نەهامەتی:

ئەو رووداوانەی كە هەڵگری رەگەزی شكستهێنان و وێرانكاری و كارەساتی مرۆیین، بە هەمان شێوە هەڵگری بەهای هەواڵن. بۆ نموونە دۆزینەوەی گۆڕێكی بە كۆمەڵ، روودانی بومەلەرزە و كارەساتی سروشتی.

### ٤. دەرەنجام و ئاكامەكان:

مەبەست لەو رواوانەیە كە كاریگەریان لەسەر تاك و كۆمەڵ هەیە و دەرەنجامەكانی واقیعێكی نوێ لە كۆمەڵگەدا دروستدەكەن. بە واتایەكی دی هەموو ئەو رووداوانەی كە كاریگەری مەودا فراوانیان لەسەر ئایندە و ژیانی هاوڵاتیان هەیە بەهای بوون بەهەواڵ مسۆگەر دەكەن، ئیدی چ بە ئاقارێكی باشدا بێت یان خراپ. بۆ نموونە زیادكردن یان كەمكردنەوەی مووچە، جێبەجێكردن یان جێبەجێنەكردنی مادەی ١٤٠ .

### ٥. دەنگوباسی ناوداران:

هەمیشە خەڵكی حەز دەكەن بزانن دەربارەی وردەكاری و تایبەتمەندێتی ژیانی كەسانی ناودار و خاوەن شوهرەت. بۆ نموونە سەرۆكی وڵات، وەزیرەكان، ئەستێرەكانی هونەر و وەرزش.

### ٦. شتی سەیر و سەمەرە:

هەموو ئەو شتانەی كە نائاشنان و لە دەرەوەی یاسا سروشتییەكانەوەن، هەمیشە هەڵگری بەهای هەواڵن. بۆ نموونە كاڵەكێك كێشەكەی ١٠٠ كیلۆگرامە، بەرخێكی دوو سەر.

### ٧. بایەخپێدانی مرۆیی:

ئەو بابەتانەیە كە رەهەندێكی خۆشئامێزیان هەیە و خەڵكی حەز دەكەن بیزانن، چونكە دەبێتە مایەی زاخاوی مێشك. بۆ نموونە كەسێكی تەمەن شەست ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ كۆلێژ، كوێرێك بەسەر شاخی ئەڤرەستدا سەردەكەوێت. ئەم شتانە گرنگ نین خەڵكیان لێ ئاگادار بكرێتەوە بەڵكو تەنها بۆ سوك كردنی هەندێك لە قورسایی هەواڵە سیاسییەكانە.

**٨. ئارەزووی گشتی:**

مەبەست لە هەموو ئەو شتانەیە کە خەڵکی حەز دەکەن لە بارەیانەوە زانیاریان هەبێت. بۆ نموونە سێکس، ئاژەڵ، زانست، مەسەلەی کات بەسەربردن.

## خاسیەتە سەرەکییەکانی هەواڵ

١- بەشێوەکی تەواوەتی هەموو پێکهاتەکانی فاکتن واتە حەقیقەتن و لە واقیعدا رویانداوە.
٢- بەهەموو شێوەیەك خاڵیە لە بیروڕای شەخسی یان ئایدۆلۆژی.
٣- پشت ئەستوورە بە وردەکاری تەواو.
٤- هەمیشە پەیوەندیدارە بەوەی کە ئێستا روودەدات.
٥- بە زمانێکی سادە دەنووسرێت، بە شێوەیەك بتوانرێت هەموو کەسێك لێی تێبگات.

## خەسڵەتە پێویستەکانی هەواڵ

کۆمەڵێك خەسڵەتی گرنگ هەن کە پێویستە لە هەواڵدا هەبن بۆ ئەوەی قورسایی و هێزی کاریگەری هەواڵەکە بخەملێت.

**a. گرنگ و دیار بێت**

هەندێ رووداو بە شێوەیەکی ئەبستراکت نابن بە هەواڵ بە تایبەتی ئەگەر گرنگ و ناسراو نەبن، بە مانایەکی دیکە هەندێ رووداو بە تەنها خۆیان هەواڵ نین بەڵکو دەبێت بەشێك بن لە رووداوی گرنگتر و گەورەتر، بە تایبەتی ئەو شتانەی رۆژانە روو دەدەن. بۆ نموونە روداوێکی هاتوچۆ لە نێوان دوو ئۆتۆمۆبیلدا، ئەنجامدانی سیمینارێك لە زانکۆ، کردنەوەی قوتابخانەیەکی ١٢ پۆلی.



**b. نزیکی و پەیوەندیداربوون**

هەر رووداوێك پەیوەندی زیاتری بە باری ناوخۆوە هەبێت لە پێشترە بۆ ئەوەی ببێتە هەواڵ. بۆ نموونە هونەرمەندێکی کورد خەڵات وەربگرێت گرنگترە لە هونەرمەندێکی ئێرانی، روداوەکانی هاتوچۆ لە هەولێر بایەخی زیاترە لە هاوتاکەی لە بەغدا.

**c. زنجیرە زەمەنییەکەی**

ئەو روداوانە زیاتر ئەگەری بەرجەستەبوونی رەگەزی هەواڵیان تێدایە کە نوێ بن، واتە (دوێنێ) نەزانرابێت. هۆکاری کات گرنگترین فاکتەرێکە بۆ بەفیڕۆدانی بەهای هەواڵ لە هەر روداوێکدا.

تێبینی: تەنها روداوێك نابێت بە هەواڵ، لەبەرئەوە دەبێت رۆژنامەنووس لە خۆی بپرسێت ئایا ئەو رووداوە تازەیە بۆچی گرنگە ببێتە هەواڵ، چی لەو روداوە دەکەوێتەوە، چۆن دەتوانم گرنگی ئەم روداوە بۆ خوێنەران بەیانبکەم.

## چی هەواڵ نییە؟

هەر شتێك تەعبیر بێت لە باری جێگیر و نەگۆڕ، هەواڵ نییە، بە واتایەکی تر باری جێگیر و نەگۆڕ the status quo هەمیشە هەواڵ نین و ناتوانرێت هەواڵیان لێ دروستبکرێت. بۆ نموونە وێستگەیەکی کارەبا ٢٠٠٠ مێگاوات کارەبا بەرهەم دەهێنێت، مانگی پێشتریش رۆژانە هەر ٢٠٠٠ هەزار مێگاوات کارەبای بەرهەم دەهێنا. ئایا ئەمە دەبێتە هەواڵ؟ نەخێر چونکە هیچ شتێك نەگۆڕاوە.

## چۆن هەواڵمان دەستدەکەوێت؟

دەستکەوتنی هەواڵ کارێکی ئاسان نییە بۆ رۆژنامەنووس لەبەرئەوە دەبێت سەلیقە و مەهارەت بنوێنێت لە پەیداکردنی هەواڵدا. پێویستە گوێکانی کراوە بن و تا دوا سنوور گوێ بیستی خەڵك بێت، هەروەها چاوەکانی کراوە بن و ئاگاداری ئەوە بێت چی روودەدات لە دەوروبەری.

**گوێ گرتن یەکەم بەهرەی رۆژنامەنووسە:**

- گوێ بگرە لەوەی خەڵك دەیڵێن.
- گوێ بگرە لەوەی چۆن دەیڵێن.
- گوێ بگرە لەوەی کە ناشیڵێن.

بە گشتی هەواڵ لە چەند سەرچاوەیەکەوە فەراهەم دەکرێن، کە لێرەدا بە پێی ریزبەندی گرنگی ئاستەکانیان ریزبەند کراون :

١. سەرچاوە سەرەکییەکان.
٢. سەرچاوە سەربەخۆکان.
٣. سەرچاوە ناکۆکەکان.
٤. سەرچاوە لاوەکییەکان.
٥. سەرچاوە نادیارەکان.

## یەکەم: سەرچاوە سەرەکییەکان

ئەمانە باشترین سەرچاوەن بۆ پەیداکردن و دروستکردنی هەواڵ و بریتین لە سەرچاوەی پلە یەك، تیایدا سەرچاوەکە هەمیشە ئارەزووی دەرکەوتن دەکات، بەگشتیش لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتوون:

**١. سەرچاوە سەرەکییە مادییەکان:**

ئەو سەرچاوانەن کە لەرێگای کۆمەڵێك میکانیزمی بابەتی و مادییەوە دەستدەکەون دەکرێن بە چەند شێوەیەکەوە:



a. بواری تایبەتمەندی

بریتییە لەو سەرچاوە زانیارییانەی لە رێگەی بوارە تایبەتمەندییەکانەوە دەستمان دەکەوێت، وەکو دامەزراوەکانی حکوومەت، دەزگاکانی ئامار، پۆلیس، پسپۆڕ و شارەزاکان، تەندروستی و خوێندن.

b. دۆکیۆمێنت و بەڵگەنامە رەسمییەکان

مەبەست لە هەموو بەڵگەنامە و نووسراوێکی فەرمییە کە میسداقیەتی روداوێك یان واقیعێك بسەلمێنێت و ژمارە و بەروار و مۆر و ئیمزای رەسمی لەسەرە.

c. بەیانی رۆژنامەوانی press releases

بریتییە لە پوختەی زانیاری دەربارەی روداوێکی دیاریکراو، کە لە لایەن دەزگای پەیوەندیدارەوە بڵاو دەکرێتەوە، بەڵام مەرج نییە هەموو وردەکارییەکی تێدا باس کرابێت، بەڵکو پێویستە رۆژنامەنووس بەدواداچونی بابەتیانەی بۆ بکات.

## ٢. سەرچاوە سەرەکییە مرۆییەکان

هەموو ئەو زانیارییانەی لە مرۆڤەکانەوە وەردەگیرێن بۆ پشتڕاستکردنەوەی هەواڵێك دەچنە خانەی سەرچاوەی مرۆییەوە، بەڵام بە هەمان شێوە رۆژنامەنووس دەبێت وریا بێت زۆرجار خەڵك بە تەواوەتی زانیاری نادەن لەسەر ئەوەی دەیزانن. سەرچاوە سەرەکییە مرۆییەکانیش چەند شێوەیەکن :

a. بەشداران لە رووداوەکاندا

مەبەست لەو کەسانەیە کە کاراکتەرەکی سەرەکین لەو روداوەدا کە ئێمە دەمانەوێت هەواڵەکەی لەسەر ئامادە بکەین، بۆ نموونە ئاسایش باندێکی بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکان دەستگیر دەکات، ئەو سەرباز و ئەفسەرانەی بەشداری ئۆپەراسیۆنەکەیان کردووە دەبنە سەرچاوە بۆ هەواڵەکە.

b. قوربانیانی رووداوەکان

مەبەست لەو کەسانەیە کە لە رووداوێکدا یاخود بەهۆی رووداوەکەوە دەبنە قوربانی و زەرەرمەند دەبن، بۆ نموونە چەکدارە یاخیبووەکان لەسەر ڕێگای عوزێم دوو کوردیان رفاند و دواتر بەرامبەر ١٠ دەفتەر دۆلار ئازادیان کردن، ئەو دوو کەسەی کە رفێنراون و خۆیان قوربانین لە نێو روداوەکەدا دەتوانرێت بکرێنە سەرچاوە بۆ هەواڵەکە.

c.شایەتحاڵی رووداوەکان

ئەو کەسانەی بینەر و ئاگاداری رووداوەکانن دەبنە سەرچاوە بۆ هەواڵ، بۆ نموونە تەقینەوەیەك لە شوێنێکدا روودەدات و کەسێکیش لە دوورەوە ئاگادار و بینەری رووداوەکە بووە، دەتوانرێت وەکو سەرچاوەی هەواڵ بەکاربهێنرێت.

## دووەم: سەرچاوە سەربەخۆکان

یاسایەکی ئاڵتوونی کاری رۆژنامەنووسی هەیە دەڵێت: «دەبێت رۆژنامەنووس لە هەموو زانیارییەك دڵنیا بێتەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی دوو سەرچاوەی سەربەخۆ». مەبەست لە سەرچاوەی سەربەخۆ وەرگرتنی زانیارییە دەربارەی رووداوێك لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە، کە هەردوو سەرچاوەکە راستبێژی رووداوەکە بسەلمێنن. بۆ نموونە ئەگەر رۆژنامەنووس سەرچاوەی A و B ی بەکارهێنا ئەوا دەبێت سەرچاوەی A زانیارییەکانی لە سەرچاوەی B وەرنەگرتبێت و بە پێچەوانەوە، یاخود هەردوو سەرچاوەکە A و B زانیارییەکانیان لە یەك سەرچاوەوە وەرنەگرتبێت واتە C ، بەڵکو دەبێت سەرچاوەی A زانیارییەکانی لە سەرچاوەی C وەرگرتبێ و سەرچاوەی B زانیارییەکانی لە سەرچاوەی D وەرگرتبێ، بەوەش دەوترێت سەرچاوەی سەربەخۆ. بۆ تێگەیشتنی زیاتر بڕوانە هاوکێشەی ژمارە یەك خوارەوە:






تێبینی: سەرچاوەی سەربەخۆ زیاتر لەو ژانرە رۆژنامەنووسیانەدا بەکاردەهێنرێت کە هەڵگری رەگەزی تەحقیقین، یاخود لە مەسەلە هەستیارەکاندا، هەروەك ئەم هاوکێشەیە دەتوانرێت لە هەموو شێوەکانی تری سەرچاوەکاندا بەکاربهێنرێت، بۆ نموونە ئەگەر سەرچاوەی سەرەکی مرۆییت بەکارهێنا ئەوا دەتوانرێت بکرێتە سەرچاوەی سەربەخۆ ئەویش بە بەکارهێنانی دوو سەرچاوەی لە یەك جیاواز وەکو ئەوەی لە هاوکێشەی سێیەمدا روونکراوەتەوە.

## سێیەم: سەرچاوە ناکۆکەکان

هەندێ جار رۆژنامەنووس رووبەڕووی دوو سەرچاوەی جیاواز و ناکۆك دەبێتەوە دەربارەی رووداوێکی دیاریکراو، بە شێوەیەك رووداوەکە بە نارۆشنی دەمێنێتەوە. لەم حاڵەتەدا پێویستە ئاماژە بە هەردوو سەرچاوەکە بکرێت و نارۆشنی لە هەواڵەکەدا پیشانی خوێنەر بدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ناکۆکی سەرچاوەی هەواڵ هەندێ کات خۆی

له خۆیدا بابەتێکی رۆژنامەوانییە، بۆ نموونە لە عیراق وەزیری ناوخۆ دەڵێت چەند چەکدارێك لە ئێرانەوە سنووری عیراقیان بەزاندووە، بەڵام وەزیری بەرگری وتی «ئەوانە چەکدار نەبوون». لێرەدا ئەم ناکۆکی و دژ بەیەکیە خۆی لە خۆیدا بابەتێکی رۆژنامەوانییە و مانای وایە حکوومەتی عیراقی بەش بەشە و هیچ تەنسیقێك لە نێوان وەزارەتەکانیدا نییە.

## چوارەم: سەرچاوە لاوەکییەکان

بریتییە لەو سەرچاوانەی کە پێشتر لە شوێنی تر بڵاوبوونەتەوە و سوودبەخش نین ئەگەر دانوسقە و گرنگ نەبن، هەمیشە لاواز دەردەکەون و بە گشتیش نیشانەی رۆژنامەنووسی تەمەڵە.

بە مانایەکی تر بریتین لە کتێب یان ئەو وتار و دۆکیۆمێنتانەی پێشتر بڵاوکراونەتەوە یان دەربارەیان نووسراوە. زۆرجار چاپەمەنی و کۆنگرە رۆژنامەنووسییەکانیش دەچنە ئەم پۆلێنەوە، چونکە سەرجەم کەناڵ و میدیاکان دەبنە خاوەنی زانیاری و رووداوەکانی کۆنگرە رۆژنامەوانییەکان، ئەمە جگە لەوەی زانیارییەکان یەك لایەنەیە و بە شێوەیەك نیشاندەدرێت وەك ئەوەی ئامادەکارانی کۆنگرە رۆژنامەنووسییەکە دەیانەوێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە زانیاری و رووداوێکی کۆنترۆڵکراوە، هەرچەندە لەوانەیە قۆستنەوەی چەند خولەکێکی دوای تەواو بوونی کۆنگرە رۆژنامەنووسییەکە ببێتە هۆی دەستکەوتنی زانیارییەکی باش.

## پێنجەم: سەرچاوە نادیارەکان

بریتییە لەو سەرچاوانەی کە ناخوازن ناویان ئاشکرا بکرێت، ئیدی لەبەر هەر هۆیەك بێت. زۆرجار هەندێ سەرچاوە زانیاری گرنگت پێدەڵێن لەسەر رووداوەکە، بەڵام ئاشکرا نەکردنی ناوەکەی لە قورسایی هەواڵەکە کەمدەکاتەوە، لەبەرئەوە رۆژنامەنووس پێویستە هەمیشە بپرسێت بۆچی ئەو سەرچاوەیە نایەوێت ناوی ئاشکرا



بکرێت. ئەگەرچی زانیارییەکانیش گرنگ بن بەڵام رۆژنامەنووس نابێت یەکسەر بە مەرجی ناو نەهێنان رازی بێت.

خۆ ئەگەر پێویست بوو ناوی سەرچاوەکە ئاشکرا نەکرێت، بە تایبەتی ئەگەر هۆکارێکی بابەتی لە پشت ناو نەهێنانەکەوە بوو، ئەوا رۆژنامەنووس دەبێت لەگەڵ سەرچاوەکەدا رێك بکەوێت لەسەر دەستنیشانکردنی دەربڕینی ناوی سەرچاوەکە بە زۆرترین وردەکاری گونجاوەوە. بۆ نموونە بەرپرسێك لە راگەیاندنی ئاسایشی سلێمانییەوە باشترە لەوەی بنوسرێت سەرچاوەیەك لە ئاسایشی سلێمانییەوە. یاخود مامۆستایەکی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان باشترە لەوەی بنوسرێت سەرچاوەیەك لە زانکۆی سلێمانییەوە، بەڵام دەبێت بزانین بەکارهێنانی سەرچاوەی نادیار یان ناونەهێنراو سنووردارە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو راستییانەی کە لە هەواڵەکەدا هاتووە.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی بابەتێکی گرنگ بخرێتە روو، ئەویش مەسەلەی (بۆ بڵاوکردنەوە) (on the record) کە پێچەوانەکەی (off the record)ە واتە (بۆ بڵاوکردنەوە نابێت).

(on the record) بریتییە لەوەی رۆژنامەنووس بە تەواوەتی ناوی سەرچاوەکە و هەموو زانیاری و وردەکاریەکانی ئەو سەرچاوەیە بڵاودەکاتەوە کە زانیارییەکانی لێوەرگرتووە، پێویستە رۆژنامەنووس هەمیشە هەوڵبدات لەسەر ئەم بنەمایە وا لە سەرچاوەکانی بکات قسەی بۆ بکەن. بەڵام ئەگەر سەرچاوەکە (off the record) بوو، مانای وایە ئەو زانیارییەی سەرچاوەکە پێشکەشت دەکات بۆ بڵاوکردنەوە نابێت و هەروەك ناشیەوێت ناوی ببرێت، بەڵام رۆژنامەنووسی کارامە ئەوەیە بتوانێت لەگەڵ ئەو سەرچاوەیە رێك بکەوێت کە بە سیغەیەك لە سیغەکان ناوی سەرچاوەکە بهێنرێت و زانیارییەکانیشی بڵاوبکرێتەوە.

**سەرچاوەی هەواڵەکان دەبێت ئاشکرا و دیار بن، مەگەر لەم حاڵەتانەدا نەبێت**

- زانیارییەکی زۆر گرنگ کە هیچ رۆژنامەیەکی تر دەستی نەکەوتبێت.
- ئەگەر سەرچاوەکە ئاشکرا بکرێت مەترسی بۆ سەر ژیانی دروستدەبێت.
- هیچ رێگەیەکی تر نەبێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییە گرنگە ئەگەر ناوی سەرچاوەکە بڵاوبکرێتەوە.
- سەرچاوەکە لە ئاستێکدا بێت کە زانیارییەکانی جێگەی بڕوا بن.
- هۆکاری ناو نەهێنانەکەی لە هەواڵەکەدا باسبکرێت.

رۆژنامەی نیویۆرك تایمز بنەمایەکی هەیە بۆ بەکارهێنانی سەرچاوەی نادیار ئەویش: «زانیارییەکی زۆر گرنگ هەبێت کە هیچ رۆژنامەیەکی تر دەستی نەکەوتبێت و شیاوی بڵاوکردنەوەش بێت، لە هەمانکاتدا هیچ رێگەیەکی تر نەبێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییانە ئەگەر ناوی سەرچاوەکە ئاشکرا بکرێت».

**پرسیارە گرنگەکان لە بەکارهێنانی سەرچاوەدا**

پێویستە رۆژنامەنووس مافی خۆی بزانێت بۆ زانینی زانیارییەکان وەکو هەر هاوڵاتییەکی ئاسایی، هەروەها دەبێت لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ زانیاری و سەرچاوەکاندا رەچاوی یاسا نێوخۆییەکانی وڵاتەکەی تایبەت بەو مەسەلەیە بکات. لە مانەش گرنگتر ئەوەیە رۆژنامەنووس نابێت ببێتە (سواڵکەری زانیاری).

**ئەو پرسیارە گرنگ و سەرەکیانەی رووبەڕووی رۆژنامەنووس دەبێتەوە لە کاتی بەکارهێنانی سەرچاوەکاندا ئەمانەن :**

١. بۆچی ئەو سەرچاوەیەی کە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ ئەنجامدەدەیت ئەو زانیارییانەت پێدەڵێت؟
٢. هاندەری ئەو سەرچاوەیە چییە لە پێدانی زانیاری بە تۆ؟
٣. ئەو سەرچاوەیە چۆن ئەو زانیارییانەی دەستکەوتووە کە بە تۆی دەڵێت؟
٤. تێوەگلانی ئەو سەرچاوەیە چییە بە روداوەکەوە؟



٥. ئایا ئەو سەرچاوەیە زانیاری هەڵەی پێنەدراوە؟
٦. ئایا پێگەی ئەو سەرچاوەیە وایە کە باشترین زانیاری بزانێت لەسەر رووداوەکە؟
٧. بۆ ئەو سەرچاوەیە هەڵدەبژێریت؟
٨. ئایا پەیوەندیکردن بەو سەرچاوەیەوە تەنها لەبەرئەوەیە کە ئاسان وەردەگیرێت؟
٩. ئایا سەرچاوەی لەو باڵاتر هەیە کە زانیاری زیاتری هەبێت لەسەر رووداوەکە؟
١٠. ئایا خوێنەران باوەڕ بەو سەرچاوەیە دەکەن؟
١١. ئایا لەدەستدانی ئەو سەرچاوەیە کاردەکاتە سەر بڕی ئەو زانیارییانەی بڵاویدەکەیتەوە؟
١٢. ئایا پەیوەندی تۆ چییە بە سەرچاوەکەوە؟
١٣. ئایا دەتوانی لەگەڵ هەموو لایەنەکاندا قسە بکەیت؟

## راهێنان

لە بارودۆخی خۆپیشانێکدا وتەبێژی وەزارەتی ناوخۆ پێتدەڵێ کە لە سلێمانی خۆپیشاندەرەکان تەقەیان لە پۆلیس کردووە و بۆتە هۆی بە خەستی برینداربوونی پۆلیسێك. پۆلیسێکیش لە سلێمانی جەخت لە هەواڵەکە دەکاتەوە.

ئایا ئەمە وەك راستی وەردەگریت یان نا؟

**کێشەکە**

ئەو زانیاریە جێگەی گومانە، چونکە دوو ئەندام لە هەمان بەرە جەخت لەسەر روداوەکە دەکەنەوە. ئایا چۆن بزانین کە وەزارەت زانیارییەکەی لە هەمان ئەو پۆلیسەوە وەرنەگرتووە؟ چۆن بزانین کە ئەمە هەواڵی پۆلیسێك نییە بۆ پاساوهێنانەوە بۆ ئەنجامدانی کاری توندوتیژی؟!

**چارەسەرەکان**

– بچۆ بۆ شوێنی رووداوەکە و پەیوەندی بکە بە خەڵکی متمانەپێکراوی ناوچەکە و قسە لەگەڵ شایەتحاڵەکاندا بکە.

- پەیوەندی بکە بە نەخۆشخانەکانەوە و بزانە پۆلیسێکیان بە برینداری بۆ براوە.
- سەردانی شوێنی رووداوەکە بکە بۆ دۆزینەوەی بەڵگەی مادی لە شوێنەکەدا وەکو (خوێن، قەوانی فیشەك).
- پەیوەندی بکە بە سەرچاوەکانتەوە لەبەرەکەی تر و بزانە چییان پێیە لەسەر رووداوەکە.

ئەگەر بۆ ئامادەکردنی هەواڵەکە نەتوانی ئەمانە بکەیت، ئەوا رستەی خۆدزینەوە و دەستەواژەی مەبەست ئاڵۆز بەکاربهێنە، واتە مەنووسە «ئەمە رویدا» بەڵکو بنووسە «فلان رادەگەیەنێت کە ئەمە روویدا». مەنووسە «فلان هەستا بەکردنی فلانە شت» بەڵکو بنووسە «سەرچاوەی A پێیوایە کە فلان هەستاوە بەکردنی فلانە شت».

ئەمە کارێکی نا ئەخلاقی نییە، بەڵکو تۆ بە شێوەیەکی راستگۆیانە ئاستی میسداقیەت و دڵنیایی هەواڵەکەت بۆ خوێنەر روندەکەیتەوە.

بۆ نموونە : لەگەڵ نزیکبوونەوەی هێرشی هاوپەیمانان لە دژی رژێمی سەدام حوسێن، هێزەکانی هاوپەیمانان لە تورکیاوە لوولەی تۆپەکانیان کردۆتە سەربازە عیراقییەکان کە نزیکن لە سنووری باکووری عیراقەوە. کاپتن تیلۆ لە هێزی هاوپەیمانان گەشبینە بەوەی هێزەکانی رژێمی سەدام حوسێن بەمزوانە بڕوخێن. کاپتن تیلۆ وتی «هێزەکانی سەدام لەم چەند هەفتەیەی رابردوودا زیاتر بێ هێز بوون بەو پێیەی زۆربەی ئەوانەی بۆی دەجەنگن هێڵەکانی بەرەی پێشەوەیان جێهێشتووە». بەڵام زەحمەتە لەوە دڵنیابین لەبەر بوونی مەترسی زۆر لە هێڵەکانی پێشەوەی بەرەنگاربوونەوە.

بە زیادکردنی «زەحمەتە لەوە دڵنیا بین» ، رۆژنامەنووس پێگەی خۆی روندەکاتەوە بۆ خوێنەر و زۆر بە کراوەیی دەڵێت زانیارییەکان تەئکیدیان لەسەر نەکراوەتەوە. ئەمە بێ مانایی نییە، لێرەدا رۆژنامەنووسەکە راستگۆ بووە لەگەڵ خوێنەرەکانیدا. بەڵام دەبێت بزانیت ئەم شێوازە تەنها وەك دوا پەناگە و دوا دەرفەت بەکاربهێنە.



## ستۆری

بریتییە لە چیرۆکێکی خەبەری ٧٠٠ بۆ ٩٠٠ وشەیی، کە رووداوێکی (سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، بابەتی گشتی و ... هتد) دەگێڕێتەوە بە بە ئاخاوتنی کەسی سێیەم و بە زمانێکی رۆژنامەوانی، کە بەشێوەی زنجیرەیەکی لۆژیکی بەدوایەکدا هاتوو زانیاری و رووداوەکان رووندەکاتەوە و تیایدا بیروڕای کاراکتەر و کەسانی پەیوەندیدار بە رووداوەکانەوە دەخرێنەڕوو، هەروەها پەرەگرافەکان بە وەسف و وشەی جوان رەنگکراوە، بە شێوەیەك وێنە لە ئەندێشەی خوێنەردا دروستدەکات.

ستۆری بە شێوەیەکی گشتی لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە :

١. زانیاری (فاکت) information.

٢. ئیقتیباس (بیرورا) quotation.

## یەکەم: زانیاری

لە ستۆریدا زانیاری ئەو پەرەگرافانەیە کە خوێنەر دەوڵەمەند دەکات بە هۆشیاری و زانین دەربارەی وردەکارییەکانی ئەو رووداوەی رۆژنامەنووسەکە لەبارەیەوە دەنووسێت، ئەو بابەتانەی وەك زانیاری لە نێو ستۆرییەکەدا باسدەکرێن دەبێت فاکت واتە راستی بن و فاکتەکانیش لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە وەرگیرابن.

زانیاری دەربارەی هەر روداوێك کە رۆژنامەنووس دەیەوێت ستۆرییەکی لەسەر بنووسێت، لە رێگەی چاوپێکەوتنەوە دەستی دەکەوێت، بەتایبەتی چاوپێکەوتنی ئەو کەسانەی کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان هەیە بە روداوەکەوە یاخود بە شێوەیەك لەشێوەکان شتێك دەیانبەستێتەوە بەو روداوەی رۆژنامەنووسەکە ستۆرییەکەی لەسەر ئامادە دەکات.

سەرباری ئەوەش بۆ فەراهەم کردنی زانیاری پێویست بۆ ستۆری دەکرێت پشت بەو پێنج سەرچاوەیە ببەسترێت کە لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان بۆ کردووە و زانیاری و روونکردنەوەی پێویستمان لەبارەیەوە نووسیوە.

**دووەم: ئیقتیباس**

بریتییە لە وتە و بیروڕای ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کراوە و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارن بەو ڕووداوەوە کە ڕۆژنامەنووس ستۆرییەکەی لەسەر ئامادەکردووە. ئیقتیباس بۆ ستۆری وەکو خوێی چێشت وایە، ئەگەر ستۆرییەکە ئیقتیباسی زۆر تێدابوو تامەکەی ناخۆش دەکات و دەبێتە بابەتی (وتی ، وتی) ، بەهەمان شێوە ئەگەر کەمیشی تێدابوو ئەوا ستۆرییەکە بێتام دەبێت تەنها زانیاری وشك دەمێنێتەوە.

ئیقتیباس هەمیشە تەعبیرە لە بیروڕا، واتە بیروڕای ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کراوە نەوەك بیروڕای ڕۆژنامەنووسەکە. دوو جۆر ئیقتیباس هەیە :

١. ئیقتیباسی ڕاستەوخۆ.

٢. ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ.

**یەکەم: ئیقتیباسی ڕاستەوخۆ direct quotation**

بریتییە لە بەکارهێنانی ئەو وتە و سەرنجانەی کە کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراودا کتومت وتویەتی بێ ئەوەی دابڕێژرێتەوە، هەمیشە بەهێز و نائاسایی دیارن و لە نێوان دوو کەوانەی لەم شێوەیەدا دەنوسرێن "..........". ئیقتیباسی ڕاستەوخۆ دوو شێوەی هەیە، ئیقتیباسی ڕاستەوخۆی تەواو، ئیقتیباسی ڕاستەوخۆی جوزئی.

a. ئیقتیباسی ڕاستەوخۆی تەواو full direct quotation

بریتییە لە ڕستەییەکی تەواو کە کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراودا پێتدەڵێت، بۆ نموونە:چۆمان عەلی وتی "تەقینەوەی ئۆتۆمۆبیلەکە وەکو بورکانێکی گەورە وابوو".



b. ئیقتیباسی ڕاستەوخۆی جوزئی partial direct quotation

بریتییە لە بەشێکی کورتی ڕستەیەکی تەواو، بۆ نموونە : چۆمان عەلی تەقینەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەی بە «بورکانێکی گەورە» وەسفکرد.

مەبەست لە بەکارهێنانی ئیقتیباسی ڕاستەوخۆ بە هەردوو شێوەکەیەوە (تەواو، جوزئی) گەیاندنی دید و بۆچون و تێڕوانینی ئەو کەسانەیە کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کراوە بۆ ستۆرییەکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بەهێز.

ئیقتیباسی ڕاستەوخۆ نابێت بە هیچ جۆرێك دەستکاری بکرێت یان دابڕێژرێتەوە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەکەوە، هەر دەستکاریکردنێك یان داڕشتنەوەیەك کارێکی نائەخلاقییە. لەبەرئەوە ئەگەر ڕۆژنامەنووس بە وردی وتەکانی کەسێکی نەنووسیبێوە لەکاتی خۆیدا یان تۆماری نەکردبوو، ئەوا ناتوانێت ئیقتیباسی ڕاستەوخۆی ئەو کەسە لە ستۆرییەکەدا بەکاربهێنێت.

**دووەم: ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ indirect quotation**

مەبەست لە ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ بریتییە لە جێکردنەوەی لێدوانێکی دوور و درێژ لە چەند ڕستەیەکی دیاریکراودا، بە پێچەوانەی ئیقتیباسی ڕاستەوخۆوە ڕۆژنامەنووس دەتوانێت دووبارە وشەکانی قسەکەرەکە ڕێك بخاتەوە و دایانبڕێژێتەوە، بە مەرجێك ناوەڕۆك و مەفهومی قسەکان نەشێوێنرێت.

ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ ئەو کاتە بەکاردەهێنرێت کە بمانەوێت کۆمەڵێك بۆچون و قسەی زۆر لە چەند ڕستەیەکدا کورت بکەینەوە یاخود بۆ جەختکردن لەسەر شتێکی تایبەت لە نێوان چەند شتێکدا. زۆرجار ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ گرنگە بۆ پێشکەشکردنی بوونیادێکی زیاتر لۆژیکی و ڕون بۆ خوێنەر. لە ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆدا جگە لە بیروڕا دەتوانرێت زانیاری و فاکتیش بخرێتەڕوو. بۆ نموونە :

محەمەد ئەسعەد ئاماژەی بەوەکرد کە ئەو کۆمەکەی بڕی ٤٥ ملیۆن دۆلارە و تەرخانکراوە بۆ بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی عیراق، سی و حەوت پرۆژەی هاوبەشی لەگەڵ کۆمپانیا عیراقییە نێوخۆییەکاندا پەسەندکردووە کە تایبەتن بە ڕێگاوبان.

**تێبینی:**

١- لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ ئیقتیباسی راستەوخۆ ئەوپەڕی ٤٦ وشە بەکاردەهێنرێت، بەڵام لە ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆدا ١٤٤ وشە بەکاردەهێنرێت.

٢- زۆر بەکارهێنانی ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ بە شێوەیەکی دوور و درێژ، کارێکی نارۆژنامەنووسییە، بە تایبەتی ئەگەر ئیقتیباسی کەسانی سیاسی و بەرپرسانی دەسەڵات بێت، چونکە ئەو هەستە لای خوێنەر دروستدەکات کە رۆژنامەنووسەکە بە راستی سەربەخۆ نییە و کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو سیاسەتمەدارە یان ئەو بەرپرسەی کە وتەکانیان دەگوێزینەوە.

٣- دەکرێت لەستۆرییەکدا ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆی کەسێك بەکاربهێنین و لە هەمانکاتیشدا ئیقتیباسی راستەوخۆی هەمان کەس بەکاربهێنین.

٤- ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ هەمیشە لە دوای ئەم وشانەوە بە کاردەهێنرێت، ئاماژەی کرد، باسی کرد، جەختی کردەوە، روونیکردەوە، پێیوابوو...

**نموونە:**

سەرنجی ئەم دوو ئیقتیباسە بدە کە لە یەکەمیاندا بە راستەوخۆیی و لە دووەمیاندا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەکارهێنراون. دەبینین بەکارهێنانی ئیقتیباسی راستەوخۆ بەهێزتر و کاریگەرترە لە ئیقتیباسی ناڕاستەوخۆ.

لینا ئەحمەد، نوێنەری کەسوکاری قوربانیانی دەستی رژێمی سەدام حوسێن لە هۆڵی دادگایی کردنی سەدام حوسێندا وتی « سەدام حوسێن ئەو هەموو خەڵکەت بۆ کوشت؟ بۆچی کچ و خوشکەکانمانت لاقەکرد؟».



ئەم ئیقتیباسە راستەوخۆیەی سەرەوە زۆر بەهێزتر و کاریگەرترە لەم ئیقتیباسە ناڕاستەوخۆیەی خوارەوە :

لینا ئەحمەد لە سەدام حوسینی پرسی بۆچی ئەو هەموو خەڵکەی کوشتووە و بۆچی ئەو هەموو ژن و کچەی لاقەکردووە.

## چۆنێتی بەکارهێنانی ئەو کەسانەی ئیقتیباسیان لێوەردەگیرێت لە نێو ستۆریدا

ئەگەر رۆژنامەنووس ئیقتیباسی هەر کەسێکی وەرگرت و بەکاریهێنا لە ستۆرییەکدا دەبێت لانیکەم ناوی تەواو، تەمەن، پیشەی ئەو کەسە بنووسیت کە ئیقتیباسەکەی لێوەرگیراوە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە دەبێت وەسفێکی کورتی شوناسی کەسەکە بۆ خوێنەر بکرێت. بۆ نموونە:

پێشواز ساڵح، ٣٥ ساڵ، خاوەن دوکانێکی زەڕەنگەر لە هەولێر

ڕێباز غەفور، ٢٨ ساڵ، مامۆستای ناوەندی لە سلێمانی

بەڵام ئەگەر کەسەکە ناسراو بوو یاخود خاوەن پۆستێکی پایەبەرز بوو ئەوا تەنها ناوی خۆی و پۆستەکەی دەنوسرێت، بۆ نموونە :

پۆل بریمەر سەرۆکی ئیدارەی ئەمریکی لە عیراق

د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح جێگری سەرۆك وەزیرانی عیراق

ئەو کەسانەی کە رۆژنامەنووس چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکات و ئیقتیباسەکانیان لە ستۆرییەکەدا بەکاردەهێنێت نابێت بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بێت، بەڵکو دەبێت کەسانێك هەڵبژێرێت کە پەیوەندیان بەو روداوەوە هەبێت کە ستۆرییەکەی لەسەر ئامادەکراوە. بۆ نموونە لە ستۆرییەکدا لەسەر ئەنفلۆنزای باڵندە ناکرێت لێدوانی وەزیری پێشمەرگەی تێدا بەکاربهێنرێت.

لە لایەکی دیکەوە پێویستە ئەو زانیارییانەی لەگەڵ ناوی کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراودا دادەنرێت، سەرباری ئەوەی دەبێت دروست و تەواو بێت، لە

هەمانکاتیشدا هاوتەریب بێت لەگەڵ ئەو بابەتەی لە ستۆرییەکەدا باسکراوە، بەشێوەیەك دەبێت پەیوەندییەکی بەهێز پێکیانەوە گرێ بدات. بۆ نموونە :

چاوپێکەوتن لەگەڵ هاوڵاتییەك ئەنجامدەدەین بە ناوی (هانا نادر)، ئەم زانیارییانەمان دەربارەی خۆی دەداتێ ..

- بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی رۆشنبیرییە کە مانگی رابردوو دەستی لە کار کێشایەوە.
- دایکی چوار منداڵی قوتابییە.
- بەڕێوەبەری رێکخراوی دیدی نوێیە بۆ عیراق کە رێکخراوێکی ناحکومییە.
- پازدە ساڵە لە ئەوروپایە و مانگی حوزەیرانی پێشوو بەیەکجاری گەڕایەوە کوردستان.

لێرەدا ناکرێت ئەم زانیارییە جیاوازانە لە یەك کاتدا بنووسین و بیخەینە پاڵ هانا نادر، هەرچەندە هەمووشیمان لە خۆیەوە وەرگرتووە، بەڵکو دەبێت بە پێی ناوەڕۆکی ستۆرییەکەمان بیگونجێنین بەم شێوەیەی خوارەوە :

a. لە ستۆرییەکدا دەربارەی گەندەڵی لە وەزارەتی رۆشنبیری دەنووسین هانا نادر بەڕێوەبەری گشتی وەزراەتی رۆشنبیرییە کە مانگی رابردوو وەك نارەزاییەك لە بوونی گەندەڵی لەو وەزارەتە دەستی لە کار کێشایەوە، وتی «............».

b. لە ستۆرییەکدا دەربارەی گیروگرفتەکانی قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی دەنووسین هانا نادر بەڕێوەبەری دیدی نوێ بۆ عیراق کە دایکی چوار منداڵی قوتابیشە، وتی: «............».

c. لە ستۆرییەکدا دەربارەی گەڕانەوەی کوردەکانی ئەوروپا بۆ کوردستان دەنووسین، هانا نادر بەڕێوەبەری دیدی نوێ بۆ عیراق کە دوای پازدە ساڵ ژیان لە ئەوروپا مانگی حوزەیرانی رابردوو بە یەکجاری گەڕایەوە کوردستان، وتی «............».



**راهێنان:**

لە خۆپیشاندانێکدا لە شاری هەڵەبجە کە لە ساڵی ١٩٨٨دا فڕۆکە جەنگییەکانی عیراق بە هەزاران ژن و منداڵ و پیاویان بە گازی کیمیاوی کوشت، یەکێك لە خۆپیشاندەرە کوردەکان هاواری کرد «دەمەوێت سەدام لەتوپەت بکەم».

ئەمە ئیقتیباسێکی راستەوخۆی کەسێکە کە تەنها ئەوەندەی لەبارەوە دەزانین کە یەکێکە لە خۆپیشاندەرەکان، بێگومان ئیقتیباسە راستەوخۆکەش بە راشکاوی گوزارشت لەوە دەکات کە زۆرێکی خەڵکی ئەو شارە هەست بەچی دەکەن، بۆیە شایەنی ئەوەیە کە بکرێتە ئیقتیباس، بەڵام لێرەدا شتێك ونە، ئەویش ناوی ئەو کەسەیە کە ئەو قسەیەی کردووە.

بەڵام ئایا رۆژنامەنووس دەتوانێت ناوی هەموو ئەو کەسانە وەربگرێت کە لە خۆپیشاندانێکی تووڕەدا هاوار دەکەن.

بە دڵنیاییەوە ئەوە کارێکی ئەستەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر رەوشەکە هێمن بووەوە رۆژنامەنووسەکە دەتوانێت بە شوێن ئەو پیاوەدا بگەڕێت و ناوی تەواو و زانیاری وردی لەسەر وەربگرێت، چونکە وەسفکردنی خۆپیشاندەرەکە مانای زیاتر دەبەخشێت بە وشەکانی یان بەهۆی زانینی باکگراوەندی کەسەکە، کە لەوانەیە پێنج کەس لە خێزانەکەی لەو هێرشەدا تیاچووبن، دەتوانین هێزێکی عاتیفیانەی زۆرتر بدەینە پاڵ وشەکان. بەمشێوەیەی خوارەوە :

لە خۆپیشاندانێکدا لە شاری هەڵەبجە کە لەساڵی ١٩٨٨دا فڕۆکە جەنگییەکانی عیراق بە هەزاران ژن و منداڵ و پیاویان بە گازی کیمیاوی کوشت، ئەنوەر غەریب، ٤٣ ساڵ، یەکێك بوو لە خۆپیشاندەرەکان کە لەو کارەساتەدا پێنج کەس لە خێزانەکەی تیاچوون، هاواری کرد « دەمەوێت سەدام لەتوپەت بکەم».

## رەگەزە سەرەکییەکانی ستۆری:

هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی ستۆری لە ئیقتیباس و زانیاری پێکهاتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند رەگەزێکی گرنگ و سەرەکی هەن پێویستە رۆژنامەنووس رەچاوی پەیڕەوکردنیان بکات بۆ ئەوەی زیاتر لە پرۆفیشناڵبوون لە نووسینی ستۆریدا نزیکی بکاتەوە و زیاتریش بتوانێت بەهۆیەوە کار لە خوێنەرەکانی بکات و کاریگەریان لەسەر دروستبکات. ئەو رەگەزانەش بریتین لە :

### یەکەم: گۆشە angle

هەموو روداوێك خاوەنی چەندین گۆشەی جیاوازە، کە رۆژنامەنووس دەتوانێت کاریان لەسەر بکات، هەڵبژاردن و دیاریکردنی هەر گۆشەیەکی ستۆرییەکە، بە پلەی یەکەم کەوتۆتە ویست و ئارەزووی رۆژنامەنووس، بەڵام کۆکردنەوە و کارکردن لەسەر چەند گۆشەیەکی جیاواز لە یەك ستۆریدا تەرکیزی رۆژنامەنووس پەرت دەکات و وای لێدەکات نەتوانێت فریای رووماڵکردنی هیچ گۆشەیەکیان بکەوێت. لەبەرئەوە دیاریکردنی گۆشەی روداو یاخود بابەتەکە تەرکیزی رۆژنامەنووس چڕ دەکاتەوە و یاریدەی ئەوەی دەدات زیاتر بتوانێت کۆنترۆڵی بکات. بۆ نموونە نووسینی ستۆرییەك لەسەر کێشەکانی گەنجان کارێکی نارۆژنامەنووسییە، چونکە ئەو بابەتە تەوەرەیە و زیاد لە گۆشەیەکی هەیە، کۆچکردن بۆهەندەران، بێکاری، بێباکی، نەمانی ئینتیما و خواردنی ماددە بێهۆشکەرەکان. هەموو ئەو گۆشە جیاوازانە لە چوارچێوەی کێشەکانی گەنجاندان، لەبەرئەوە رۆژنامەنووس ناتوانێت لە میانەی ستۆرییەکدا رووماڵی هەموو ئەو گۆشە جیاوازانە بکات، هەربۆیە پێویستە یەك گۆشە دیاریبکرێت و کاری لەسەر بکرێت. کەواتە دیاریکردنی گۆشەی روداو یاخود کێشەکە یەکێکە لە ڕەگەزەکانی ستۆرییەکی بەهێز و پرۆفیشناڵ.



### دووەم: هاوسەنگی balance

پێویستە رۆژنامەنووس لە دەرەوەی ئەو بابەتە بێت کە ستۆرییەکەی لەسەر نووسیوە، واتە بە هیچ شێوەیەك نابێت رای ریپۆرتەر یاخود رۆژنامەنووسەکە لە نێو ستۆرییەکەدا رەنگبداتەوە، بەڵکو دەبێت سەلیقە بەکاربهێنێت و بزانێت چەند لایەن پەیوەندی بە بابەتی ستۆرییەکەیەوە هەیە بیاندوێنێت و فەرامۆشیان نەکات. بە واتایەکی دیکە ئەگەر قسەیەکت لە سەرچاوەیەکەوە وەرگرت ئەوا دەبێت بۆچونێکی جیاواز یان دژ بەو لە سەرچاوەیەکی ترەوە وەربگریت، ئەویش بۆ راگرتنی هاوسەنگی ستۆرییەکە.

بۆ نموونە ئەگەر ئیقتیباسی چوار هاولاتیت وەرگرت لە ستۆرییەکدا لەسەر پلانە ئەمنییەکەی نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانی عیراق، نابێت هەر چواریان یەك بیروڕایان هەبێت، واتە هەر چواریان پێیان وابێت کە پلانە ئەمنییەکە کارە توندوتیژییەکانی بەغدای پایتەختی کەمکردۆتەوە، بەڵکو دەبێت بگەڕێین بە شوێن ئەو هاولاتیانەشدا کە پێچەوانەی ئەو رایەیان هەیە. ئەگەر ڕاو ڕای پێچەوانە و جیاواز لە ستۆرییەکەدا نەبێت ئەوا هاوسەنگی بیروڕاکان تێکدەچێت و رۆژنامەنووس بێلایەنی و سەربەخۆیی لە دەست دەدات.

### سێیەم: پێشینە background

رۆژنامەنووس هەمیشە دەبێت بە شێوەیەك بنووسێت وا هەستبکات کە خوێنەرەکەی بێ ئاگایە لە زنجیرەی رووداوەکان و زانیاری وردی نییە لەسەر کەسایەتی و ئەو کاراکتەرانەی لە نێو ستۆرییەکەدا باسدەکرێن، لەبەرئەوە دەبێت هەمیشە نا و و پلەی تەواوی کەسایەتییەکان بنووسێت و کورتکراوەی دەزگا و رێکخراوەکانیش شیبکاتەوە. ئەمە سەرباری شوێن و پێگەی جوگرافی ئەو ناوچانەی باس دەکرێن، بۆ نموونە شارباژێر لە باکووری شاری سلێمانی، ئەبوغرێب لە خۆرئاوای شاری بەغدا.

جگە لەوانە نووسینی کورتە مێژوویەکی چەند دێڕیی لەسەر هەندێ کارەسات و رووداو کە لە ستۆرییەکەدا باسدەکرێن، شتێکی پێویستە، بۆ نموونە کارەساتی ئەنفال

کە هێزەکانی عیراق لە ساڵی ١٩٨٨ کردیانە سەر گوندەکانی کوردستان و ١٨٢ هەزار هاوڵاتی تێدا بێ سەرو شوێنکرا. یاخود زانکۆی سلێمانی کە لە ساڵی ١٩٦٨ دامەزراوە و ساڵی ١٩٨١ حکوومەتی عیراقی گواستییەوە بۆ هەولێر و ساڵی ١٩٩٢ دامەزرێنرایەوە.

بەڵام ڕۆژنامەنووس دەبێت وریا بێت چونکە زانیاری زۆر و ناپێویست خوێنەر چەواشە و ماندوو دەکات و لەوانەیە گۆشەی ستۆرییەکەش بشێوێنێت، لەبەرئەوە دەبێت بە هۆشیاری و کارامەیی مامەڵە لەگەڵ باکگراوەندی کاراکتەر و ڕووداوەکانی ستۆرییەکەدا بکرێت.

**چوارەم: سیاق frame**

بریتییە لە پەرەگرافێك یان چەند پەرەگرافێك بەمەبەستی فراوانکردنی پێشینەی بابەتەکە و پەیوەستکردنەوەی گۆشەی ستۆرییەکە بە پەرەسەندنە هەنووکەییەکانی ناوچەکەوە، ئەویش بە پێشکەشکردنی کۆمەڵە ڕووداوێکی ناسەرەکی بە پێی بە دوایەکدا هاتنە زەمەنییەکەی کە پەیوەندیان هەیە بە بابەتی چیرۆکەکەوە، بە مەرجێك ئاماژە بە گرنگییەکەی بکرێت. بە واتایەکی دیکە بە شێوەیەکی ئاسان و کورت ئەو ڕوداوانە ڕوون بکەرەوە کە پێش ڕوداوە تازەکە ڕوویانداوە، پاشان دواترین ڕووداو بخەرە سیاقی تازەترین پەرەسەندنەوە. بۆ زیاتر تێگەیشتن لە ڕەگەزی سیاق لە نێو ستۆریدا ئەم ستۆرییەی خوارەوە بخوێنەرەوە :



## زیندووکردنەوەی سینەمای عێراقی هێشتا لە سەرەتادایە

لە یەکێك لە ڤیستیڤاڵەکانی فلیمدا، کە بە یەکەم هەوڵی لەو شێوەیە دادەنرێت لە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام حسێنەوە، فلیمسازان تەرکیزیان خستەسەر بابەتی تیرۆریزم و توندوتیژی و سەردەمی بەعس و بارودۆخی ئێستای کۆمەڵایەتی.

لەو ڤیستیڤاڵەی کە لەلایەن کۆمپانیای فلیمی ئەڤینەوە لە شاری هەولێری کوردستانی عێراق سازکرا، نزیکەی ٥٠ کورتە فیلم نیشاندران کە بەرهەمی فلیمسازانی کورد و عەرەب بوون و لە ڕۆژانی ١-٣ی ئەیلول سازکراو بابەتی دژە توندوتیژی لەخۆگرتبوو.

سازکردنی ئەو ڤیستیڤاڵە چەند ڕۆژێك دوای لە دەستدانی گەورەترین ژمارەی خەڵك هات لە تاکە ڕووداوێکدا لەو کاتەوەی ئەمەریکا هێرشی کردووەتە سەر عێراق لە مانگی ئاداری ساڵی ٢٠٠٣. ڕۆژی ٣١ی ئاب نزیکەی ١٠٠٠ عێراقی لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی شیعەکاندا کە بەبۆنەی مەراسیمێکی ئایینییەوە سازکرابوو، گیانیان لە دەستدا دوای ئەوەی کەسێك هاواری ئەوەیکرد کە تەقینەوەیەکی خۆکوژی هەیە، لە ژمارەیەکی زۆر بوون بە ژێر پێیوە ئەمە لە کاتێکدا ژمارەیەکی تریش خۆیان هەڵدایە ڕوباری دیجلەوە لەگەڵ ئەوەی مەلەشیان نەئەزانی.

ئەنوەر شێخانی، سەرپەرشتیاری ڤیستیڤاڵەکە، ئاماژەی بەوەکرد کە مەبەستی ڤیستیڤاڵەکە ئەوەبوو بە زمانی سینەما ڕووبەڕووی تیرۆرستان ببنەوە. هەروەك پێشی وابوو کە ڤیستیڤاڵەکە ئەوەی نیشاندا کە یاخیبووان ناتوانن ژیانی عێراقییەکان بروخێنن.

شێخانی وتی «ئەگەر چی فلیمەکان تەکنیکی سینەمایی بەرزیان تێدا بەکارنەهاتووە، بەڵام مایەی دڵخۆشییە، چونکە لە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام، ئەمە یەکەمین ڤیستیڤاڵی سینەمایە کە لەم ئاستەدا لە عێراقدا ڕێکخرابێت».

ڕائید ئەمجەد، دەرهێنەرێکی سینەمایی بوو لە بەغداد، بە فیلمێك بەشداری ڤیستیڤاڵەکەی کردبوو بە ناوی « ئایندە». فلیمەکەی ڕائید باسی لە سیستەمی پڕ

لە کەموکوڕی پەروەردە دەکرد لە قوتابخانەکاندا هەروەها باسی لە خراپ پەروەردەکردنی هەندێ لە منداڵانیش دەکرد لەلایەن دایکان و باوکانەوە، ئەمەش چۆن دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی یاخیبووان لە ئایندەدا. رائید وتی «کۆبوونەوەی هونەرمەندان لەم ڤیستیڤاڵەدا ئەوە دەردەخات کە عێراقییەکان دژی تیرۆر و تیرۆریستانن».

تابان یاسین، دەرهێنەرێکی تری سینەمایی دانیشتووی سلێمانی بوو، تەرکیزی خستە سەر کردەوە سەرکوتکارەکانی سەدام حسێن لە فیلمێکدا کە ناوی (پۆستاڵ) بوو. تابان وتی «سینەما لە عێراقدا زۆر لاوازە، بەڵام هیواداریین لە رێگەی ئەم ڤیستیڤاڵەوە ئایندەی سینەمای عێراقی هەنگاوێکی بەرز بنێت»، هەروەها باسی لەوەشکرد سەرکەوتنی سەرەکی ڤیستیڤاڵەکە لەوەدا بوو کە هونەرمەندانی چەندین گرووپی نەژادی و ئایینی جیاواز کۆکردەوە.

شێرزاد حەسەن، نووسەر، کە لە لیژنەی هەڵسەنگاندنی فیلمە نمایشکراوەکاندا بوو، دانیبەوەدا نا کە ئەو فیلمانە لە رووی کوالیتییەوە لە ئاستێکی بەرزدا نەبوون، بەڵام لە هەمانکاتدا ئاماژەی بەوەشکرد کە گرنگ بوون وەك ناوەندێك بۆ درکاندنی هەست و نیگەرانی عێراقییەکان. شێرزاد حەسەن وتی «بەهۆی ئەوەوە، هەندێکیان شایەنی ئەوەن لەدەرەوەی عێراق نیشانبدرێن».

## پێنجەم: وردەکاری و رەنگکردن detail & coaler

رۆژنامەنووس لە نووسینی ستۆریدا هەمیشە پێویستە دوورتر لە فاکتە زانراوەکان بڕوات و بانکی زانیاری خوێنەر بە تەواوی پڕ بکاتەوە، ئەویش لە رێگەی بەکارهێنانی وردەکاری لە نووسیندا.

بەکارهێنانی وردەکاری دەربارەی کاراکتەر و رووداوەکانی نێو ستۆرییەکە زامنکردنی ئەوەیە کە خوێنەر پەلکێش دەکاتە نێو پنتە جیاوازەکانی ستۆرییەکەوە و لە رێگەی وشەوە وێنەی راستەقینەی کاراکتەر و دیاردە و رووداوەکانی نێو ستۆرییەکە پیشانی خوێنەر دەدات.



بە واتایەکی دیکە رۆژنامەنووس دەبێت لە رێگەی راستییە رازێنەرەکانەوە چیرۆکەکەی وەسف بکات نەك لە ڕێگەی ئاوەڵناوەوە، بە هەمان شێوە رۆژنامەنووس پێویستە بە هۆی بە کارهێنانی وردەکارییەوە بتوانێت چیرۆکەکەی لە رێگەی جووڵەوە بگێڕێتەوە نەوەك تەنها لە رێگەی نووسینی وشکەوە، واتە بە (نووسین وێنە بگرێت).

ئەگەر ویستمان وردەکاری لە بەکارهێنانی بەرواردا پەیڕەو بکەین نابێت بنووسین هەفتەی رابردوو یان مانگی پێشوو، بەڵکو پێویستە مێژووەکەی دیاریبکەین.

مەبەست لە رەگەزی وردەکاری و رەنگکردن بۆ نموونە لە بەکارهێنانی ئیقتیباسی ئەو کەسانەی لە ستۆرییەکەدا ناویان هاتووە، جگە لە ناو و تەمەن و پیشەکەیان، بریتییە لە باسکردن و نیشاندانی باری دەروونی و شێوەی جلوبەرگ و سیمای دەموچاویان، چونکە نووسینی ئەم وردەکارییانە وێنەی ئاشکراتری کاراکتەرەکان لە مێشکی خوێنەردا بەجێدەهێڵێت. بۆ نموونە:

- ئازاد نامیق، ٣١ ساڵ، کرێکار، بە جلوبەرگی کارەکەیەوە لەسەر کورسییەکی کۆن دانیشتبوو هێواش هێواش نەفەسی لە جگەرەکەی دەستی دەدا، وتی «..........».

- حەلیمە عەلی، ٥٩ ساڵ، ژنی ماڵەوە، کە ماوەی ١٥ ساڵە بەرگی رەشی فڕێنەداوە، لەبەر تیشکی خۆری نیوەڕۆیەکی بەهار وێنەی دوو کوڕە ئەنفالکراوەکەی لە باوەشدا بوو، وتی: «..........».

## شەشەم: پەرەگرافی پرد

پەرەگرافی پرد یاخود نێتگراف گرنگترین رەگەزی ستۆرییە چونکە لە رێگەی ئەم پەرەگرافەوە رۆژنامەنووس بە خوێنەر دەڵێت کە بابەتی ستۆرییەکەی بۆچی گرنگە. بە مانایەکی دی رۆژنامەنووس لە رێگەی نێتگرافەوە روونیدەکاتەوە بۆچی بابەتی ستۆرییەکەی گرنگە و شایستەی ئەوەیە لە بارەیەوە بنووسرێت، هەر لە رێگەی ئەم رەگەزەوە بە خوێنەریش دەڵێت کە ئەو رووداوە تازەیە لەوانەیە کار لەچی بکات و چۆن کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا بەجێدەهێڵێت و چۆن بارودۆخی وڵات لە رێگەی دەرەنجامی

ڕووداوەکەوە دەگۆڕێت و پەردەدەسێنێت. واتە تەنها وەڵامدانەوەی پرسیاری ئەوەی بۆچی ئەم بابەتە گرنگە لە بارەیەوە بنوسرێت خۆی لە خۆیدا بریتییە لە پەرەگرافی پرد.

## سکێچی گشتی ستۆری

بەشێوەیەکی گشتی و سادە بە ڕەچاوکردنی ڕەگەزەکانی ستۆری و بەدەر لە ستایلە جیاوازەکانی نووسینی ستۆری کە دواتر بە درێژی لەبارەیانەوە ئەدوێین، دەتوانین سکێچی گشتی ستۆری بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان بکەین :

**ناونیشان**

هەڵبژاردنی ناونیشان کاری موحەڕریری ڕۆژنامەنووسی ئەو دەزگایەیە کە ستۆرییەکەی بۆ ئامادەکراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ریپۆرتەر مافی ئەوەی هەیە پێشنیاری دیاریکردنی ناونیشانی گونجاو بکات بۆ موحەڕیرەکەی.

**لید**

بریتییە لە بەشی یەکەمی ستۆری و گرنگترین ماددە لە خۆدەگرێت و بابەتە سەرەکییەکانی ستۆرییەکە پێشکەشدەکات. هەمیشە لە کورتە چیرۆکێکی مرۆیی پێکدێت بۆ گوزارشت کردن لە ڕووداو یان دیاردەیەکی گەورەتر کە ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە، جگە لە لیدی خەبەری کە لە ستۆری سیاسیدا بەکاردێت و بە بکەر و فرمان (فاعل + فعل) دەستپێدەکات.

لید وەك قولاپێك وایە بۆ ڕاکێشانی هەست و سۆزی خوێنەر بەمەبەستی بە دواداچوونی ستۆرییەکە تا کۆتاییەکەی، هەربۆیە دەبێت لە لیددا بە خوێنەر بوترێت چی ڕوویداوە و ستۆرییەکە دەربارەی چی دەدوێت، بە پێچەوانەی فیلمەوە کە لە کۆتاییدا پێماندەڵێت چی ڕوویداوە. بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییەش لەبەرچاو بگیرێت کە لید بۆنوبەرامەی ستۆرییەکەیە نەك هەموو وردەکارییەکانی.

**پەرەگرافی پرد**

پەرەگرافی ڕوونکردنەوە و درێژەپێدان



لەم بەشەدا بابەتی ستۆرییەکە فراوان دەکرێ و ڕەهەندە جیاواز و دژ بەیەکەکانی دەخرێنەڕوو، پاشان پێشینەی بابەتەکە فراوان دەکرێت و ئیقتیباس و لێدوانی سەرنجڕاکێش و گرنگ کە پەیوەندیان بە ڕووداوی ستۆرییەکەوە هەیە پێشکەش دەکرێن. هەروەها بابەتی ستۆرییەکە دەخرێتە نێو سیاقی تازەترین پەرەسەندن و ڕووداوی کۆمەڵگەوە، بە مەرجێك گۆشەی سەرەکی ستۆرییەکە نەشێوێنرێت. دەکرێت کورتە چیرۆکی چەند کەسێکی دی کە تەعبیر لە هەمان بابەتی ستۆرییەکە بکەن بەڵام لە دۆخی جیاوازدا بخرێنەڕوو.

**پەرەگرافی کۆتایی**

لە پەرەگرافی کۆتاییدا دوا وێنە لە ئەندێشەی خوێنەردا بەجێدەهێڵرێت بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی تازە و بیرۆکەی نوێی تێدا بێت. لەم بەشەدا بیرخستنەوەیەکی کورت سەبارەت بە گرنگی ڕووداوەکە پێویستە پێشکەش بکرێت، هەروەها دەبێت ڕۆژنامەنووس بتوانێت لەم پەرەگرافەدا هەستی کۆتایی پێهێنانی بابەتەکە لای خوێنەر دروستبکات.

## ستایلەکانی نووسینی ستۆری

هەرچەندە دیاریکردنی ستایل و شێوازی تایبەتی بۆ نووسین کارێکی نادروستە چونکە ڕۆژنامەنووس کۆنترۆڵ دەکات و ئاسۆی بینین و تێفکرینەکانی کۆتوبەند

وەك لە ڕەگەزەکانی ستۆریدا باسمان لێوەکرد، پەرەگرافی پرد یان نەتگراف هەمیشە لە دوای لیدەوە دێت، ڕۆژنامەنووس لە ڕێگەی ئەم پەرەگرافەوە لە چیرۆکە بچووکەکەوە ئینتیقال دەکات بۆ بابەتە گەورەکە و هێڵی گشتی ستۆرییەکە لەگەڵ ڕوونکردنەوە و باسکردنی کاریگەری و گرنگی دەرەنجام و کاردانەوەی بابەتی ستۆرییەکە لەسەر کۆمەڵگە و ڕای گشتی.دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ فەراهەم کردنی ستانداردێکی نێودەوڵەتی لە نووسینی ستۆری و یەکخستنی زمانێکی ڕۆژنامەوانی یەکانگیر، پسپۆڕانی ڕۆژنامەگەری سێ ستایلی سەرەکیان جیاکردۆتەوە بۆ نووسینی ستۆری، کە تا ئێستا

زۆربەی رۆژنامەنووسە پرۆفیشناڵەکان پێیانوایە ئەو سێ بوونیادە یاخود ئەو سێ مۆدیلە وەك رێبەرێك بەسوودە و یاریدەی رۆژنامەنووس دەدات لە دروستکردنی بیرکردنەوەی رۆژنامەنووسی لە نووسینی ستۆریدا.

بەڵام نابێت وەکو سیستمێکی دۆگما لەلایەن رۆژنامەنووسەوە تەماشا بکرێت، بەڵکو پێویستە وەکو زەمینەیەکی سوودبەخش بۆ دارشتن و ئەفراندنی نووسینی ستۆرییەکە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. بە مانایەکی دی مەرج نییە رۆژنامەنووس کتومت بە یەکێك لەو سێ ستایلە بنووسێت، بەڵام مەرجە رەچاوی رەگەزە سەرەکییەکانی ستۆری بکرێت لە نووسیندا.

## یەکەم: بوونیادی هەرەمی هەڵگەڕاوە

ئەم ستایلە بەشێوەیەکی سەرەکی لە نووسینی ستۆری سیاسیدا بەکاردەهێنرێت، تیایدا زانیارییەکان بە شێوازێکی هەرەمی هەڵگەڕاوە ریزبەند دەکرێت، واتە لە بەشی سەرەوەی هەرەمەکە گرنگترین زانیاری دادەنرێت و لەگەڵ زنجیرەی بەردەوامی پەرەگرافەکانی دواتردا گرنگی زانیارییەکان کەم دەبێتەوە، بەشێوەیەك لە کۆتا بەشی ستۆرییەکەدا هیچ زانیاریەیکی تێدا نییە کە لەکاتی تەحریر کردندا ئەگەر لابرێت لە بایەخی ستۆرییەکە کەم بکاتەوە.

ئەم ستایلە رەچاوی دوو بنەمای گرنگ دەکات :

A. پێویستی خوێنەر فەراهەم دەکات بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی خێراو ئاشکرا راستی و زانیارییەکانی پێبگات.

B. پێویستی موحەریر فەراهەم دەکات بۆ ئەوەی بەخێرایی ستۆرییەکە کورت بکاتەوە لە کاتی روودانی هەر گۆڕانکاریەکدا.

ستایلی هەرەمی هەڵگەڕاوە لە چوار بەشی سەرەکی پێکدێت : (لید، روونکردنەوە، درێژەپێدان و کۆتایی)، بۆ زانیاری زیاتر تەماشای هێڵکاری ژمارە یەك بکەن.



### بەشەکانی بوونیادی هەرەمی هەڵگەڕاوە

### ١- لید lead

بەشی سەرەوەی هەرەمی ستۆرییەکە و گرنگترین ماددەی چیرۆکەکە لە خۆدەگرێت و تیایدا بەشێوەیەکی کورت و پوخت زانیاری و هێڵی گشتی رووداوەکە دەخرێتەڕوو بە جۆرێك بتوانێت وێنەیەکی سەرەتایی و ئاسانی رووداوەکە لە ئەندێشەی خوێنەردا دروست بکات، بەمەبەستی کەمەندکێش کردنی سەرنجی خوێنەر، بەڵام وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا لید بۆن و بەرامەی ستۆرییەکەیە نەك هەموو وردەکارییەکانی.

هەمیشە لە پەیڕەوکردنی ستایلی هەرەمی هەڵگەڕاوەدا بە لیدێکی خەبەری دەستپێدەکرێت، کە تیایدا رونکراوەتەوە (کێ چی کرد)، واتە لەم ستایلەدا لید بە بکەر و فرمان دەستپێدەکات و دواتر وەڵامی پرسیارەکانی تری وەکو (لەکوێ، کەی، بۆچی) دەدرێتەوە. سەرەتای سەرکەوتوو ٢٥ بۆ ٤٠ وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا، لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە لە یەك پەرەگراف پێکهاتبێت.

باشترین لید پێویستە پوخت و ئاسان بێت بۆ تێگەیشتن و ئەوەندەی بکرێت وەڵامی پێنج پرسیارە سەرەکییەکە (who, what, where when, why) بدرێتەوە، بە مەرجێك بە بکەر و فرمان دەستپێبکات، واتە (کێ چی کرد). رۆژنامەنووس هەتا دەتوانێت پێویستە لیدەکەی بە (رستەی بکەر دیار) بنووسێت و بتوانێت بیگونجێنێت لە رستەیەکی خەبەری ئاساندا.

### ٢- روونکردنەوە explanation

بەشی دووەمی بوونیادی هەرەمەکەیە و تیایدا روونکردنەوەی زیاتر لەسەر راستییە سەرەکییەکانی چیرۆکەکە دەخاتەڕوو. هەروەها وردەکاری لەسەر کاراکتەرەکانی رووداوەکە پێشنیگا دەکات و ئەو کەس و لایەن و رێکخراوانەش

پیشاندەدات کە بەشێوەیەك لە شێوەکان تێوەگلاون. جگە لەوە دەتوانرێت لەم بەشەدا ئەو جەدەل و گفتوگۆیانەش باسبکرێن کە ئەگەرە جیاوازەکانی رووداوەکە دروستیکردون.

لە بونیادی هەرەمی هەڵگەڕاوەدا کە زیاتر لە نووسینی ستۆری سیاسیدا بەکاردێت، هەمیشە لە بەشی روونکردنەوەدا لێدوانێکی فەرمی بەکاردەهێنرێت، بەو مەرجەی بواری تایبەتمەندێتی ئەو کەسەی لێدوانە فەرمییەکەی لێوەردەگیرێت پەیوەندییەکی راستەوخۆ و ئۆرگانیکی هەبێت بە رووداوی چیرۆکەکەمانەوە.

**بونیادی هەرەمی هەڵگەڕاوە**




هەر لەم بەشەدا دەتوانین پەرەگرافی پرد یاخود نەتگراف بنووسین، کە تیایدا گرنگی رووداوەکە و دەرەنجام و کاریگەرییەکانی ستۆرییەکە بۆ خوێنەر روون دەکرێتەوە.



### ٣- درێژەپێدان amplification

لەم بەشەدا روونکردنەوەی زۆرتر پێشکەشدەکرێت لەسەر ئەو مەسەلانەی زیاتر جێی بایەخن، لە هەمان کاتیشدا وردەکارییە بچووك و شاردراوەکانی رووداوەکە دەخرێنەڕوو، هەروەها دیدگا سەرەکییەکانی چیرۆکەکە بەرفراوانتر دەکرێن و ئیقتیباس و لێدوانی سەرنج راکێش و ئاڕاستە جیاوازی کەسانی تر لە دۆخی جیاوازدا بەکاردەهێنرێن، بەو مەرجەی پەیوەندیدار بن بە رووداوی ستۆرییەکەوە، هەر لەم بەشەدا دەتوانرێت سیاق ئیزافە بکرێتە نێو پەرەگرافەکانەوە. بەشی درێژەپێدان دوا دەرفەتی ریپۆرتەرە بۆ پێشکەش کردنی هەر زانیارییەکی گرنگ و پێویست دەربارەی چیرۆکەکە.

### ٤- کۆتایی پێهێنان closing

کۆتایی پێهێنان دوا بەشە لە بونیادی هەرەمی هەڵگەڕاوەدا، لەم بەشەدا پێویستە پەرەگرافە جیاجیاکانی چیرۆکەکە بۆ لای یەك نزیك بکرێتەوە، بەجۆرێك شێوەیەکی گرێمانکراو بدات بە دەستەوە یاخود وێنەیەکی سەرتاپاگیر بەرجەستە بکات.

لەم بەشەدا بە هیچ شێوەیەك نابێت زانیاری نوێی تێدا بێت یاخود بیرۆکەیەکی تازە و گرنگ پێشکەش بکات، بەڵکو دەبێت هەستی کۆتایی پێهێنانی چیرۆکەکە لای خوێنەر دروستبکرێت. لەم بەشەدا یادهێنانەوە و بیرخستنەوەی خوێنەر بۆ هەندێ مەسەلەی گرنگ کارێکی پێویستە.

بۆ تێگەیشتنی زیاتر بڕوانە ئەم ستۆرییە کە بە ستایڵی هەرەمی هەڵگەڕاوە نووسراوە: **سلێمانی بەهۆی خەڵکەکەیەوە ئاسایشی شارەکەیان پاراستووە**

فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی

بەرپرسانی ئاسایشی سلێمانی دانبەوەدا دەنێن کە دانیشتوانە چاو کراوەکە وای کردووە کە ئەم شارەی باکوور بە هێمنی بمێنێتەوە و دووربێت لەو توندوتیژیانەی کە بەشەکانی تری وڵاتی گرتووەتەوە.

ڕۆژانە نزیکەی ٧٠ کەس پەیوەندی بە (jcc) (سەنتەری ڕێکخەری پەیوەندییەکان) دەکەن بۆ هەواڵدان لەسەر شتی گوماندار. هەرچەندە هەندێ لەو زانیارییانە جێی بایەخ نابن، وەك ئەوەی ئۆتۆمبیلێك کە تایەکانی خوێنی پێوەبوو پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە خوێنی مریشکێکی سەربڕاوە و وەك نەریتێك بۆ کڕینی ئەو ئۆتۆمبیلە تازەیە سەربڕدراوە، بەڵام هەندێ زانیاری تر بوونەتە هۆی ڕزگارکردنی گیانی هاوڵاتیان.

لە مانگی ئابی ٢٠٠٤دا خۆکوژێك بە ئۆتۆمبیلێکی ڕەنگ ڕەشی جۆری BMW ویستی ئوتێلی سلێمانی پالاسی بەناوبانگ کە زۆربەی بیانییەکان تیایدا دەمێننەوە بتەقێنێتەوە، یەکێك لە بەرپرسانی ئاسایش کە نەیوست ناوی خۆی ببات بە ئەنستیتۆی ڕۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی IWPR ڕاگەیاند بە هۆی ئەو زانیارییانەی کە پاسەوانەکانی ئۆتێلەکە و خەڵك دابوویان بە هێزەکانی ئاسایش و لایەنە پەیوەندیدارەکان توانرا هێرشەکە پووچەڵکبرێتەوە.

عەمید خۆشەویست جەمال بەڕێوەبەری سەنتەری ڕێکخەری پەیوەندییەکان کە سەر بە وەزارەتی ناوخۆی ئیدارەی سلێمانییە، وتی «هاوڵاتیان هەر کە کارێکی نائاسایی گومانلێکراو بەدیدەکەن ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە سەنتەرەکەی ئێمەوە دەکەن و ئێمەش زۆر بەخێرایی بەدەمیانەوە دەچین»، هەروەها وتیشی «هاوڵاتیان لە پاراستنی باری ئەمنی شاری سلێمانیدا وەکو چاوێکی کراوە وان بۆ ئێمە».

ڕەحیم سابیر دووکاندار نموونەی ئەو کەسانەیە کە سوورە لەسەر پاراستنی شارەکە تا بەدووربێت لە تەقینەوەو خوێن ڕشتن، ئەو شارەی کە لە لەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە بەڕێوەدەبرێت، کە یەکێکە لە دوو پارتە سەرەکییەکەی کوردستان. ڕەحیم وتی «بچووکترین گومانم لە هەر ئۆتۆمبیل یان هەر مرۆڤێکی نامۆ و نائاسایی بێت یەکسەر لایەنە ئەمنییەکان ئاگادار دەکەمەوە».

عادل علی سەرپەرشتیاری ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان لە وەزارەتی ناوخۆ، وتی:» ئەگەرچی هەندێ زانیاری وەك ئەوەی خوێن بە تایەی ئۆتۆمبیلێکەوە بووە دوای



بەدواداچوون دەرکەوت کە خوێنی مریشك بووە، پێکەنیناوین بەڵام نیازپاکی خەڵك نیشاندەدەن لە ئاگادارکردنەوەی لایەنی پەیوەندیدار».

عادل وتی» ئەگەر چی ئەم ڕووداوە شتێکی پێکەنیناوییە بەڵام ئاماژەن بۆ دڵسۆزی خەڵکی شاری سلێمانی لە زوو ئاگادارکردنەوەی هێزەکانی ئاسایش لە هەر مەسەلەیەك گومان هەڵبگرێت.»

کوردستانی عێراق تاڕادەیەك ئارام بووە بە بەراوردکردن بە بەشەکانی تری وڵات، هەرچەندە شارەکانی وەك هەولێری پایتەخت و شاری دهۆك کە لە ژێر دەسەڵاتی پارتیدان لە هێرش بەدوور نەبوون، لەو چوارچێوەیەدا ڕۆژی ٤ی ئایار تەقینەوەیەکی خۆکوژی بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە ٦٠ کەس لە بنکەیەکی دامەزراندنی پۆلیس لە هەولێر.

سەرکەوت حەسەن بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی ڕایگەیاند کە سەرەڕای هاوکاری خەڵك، کارمەندەکانی ئاسایشیش تۆکمە و لێهاتوون و قابیلی کارەکەی خۆیانن، هەربۆیە شارەکە بەسەلامەتی ماوەتەوە. بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی باسی لەوەش کرد لەو کارانەی دەیکەن کۆکردنەوەی زانیارییە لەسەر هەموو ئەوانەی کە تازە دێنە ناو شارەوە، بەتایبەت ئەو کەسانەی کە بە مەبەستی پەیداکردنی ئیش دێنە سلێمانییەوە.

لە ئەنجامی ئەو هاوکاری و هەماهەنگییەی نێوان خەڵك و ئاسایش بێگانەکان هەست بەوە دەکەن کە ناوچەکە ئەوەندە سەلامەتە ئەوان بتوانن سەرمایەگوزاری تێدا بکەنەگەر، بازرگانێکی تورك کە بە بارودۆخەکە خۆشحاڵ بوو بە ئەنستیتۆی ڕۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی ڕاگەیاند» سلێمانی شارێکی ئارام و پارێزراوە».

**دووەم: بوونیادی هەرەمی دەستکاریکراو the adjusted pyramid structure**

نووسینی ستۆری لەم ستایلەدا پشت دەبەستێت بە تێکەڵکردنی زانیاری وشك و ئەبستراکت لەگەڵ ڕازاندنەوە و وەسف و ڕەنگکردندا. ئەم ستایلە دەبێتە مایەی ئەوەی زانیاری وشك لەگەڵ وەسف و ڕازاندنەوەدا ئاوێتە بکرێن، لە پێناو ئەوەی

ئارەزووی خوێنەر بهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام بێت لە خوێندنەوەی ستۆرییەکە.

بوونیادی ستۆری لەم ستایلەدا بە هەمان شێوە هەرەمییە بەڵام هەرەمێکی دەستکاریکراو. رۆژنامەنووس دەتوانێت بۆ نووسینی هەموو جۆرەکانی ستۆری پەیڕەوی لەم ستایلە بکات بەمەرجێك بابەتی ستۆرییەکە هەڵگری وەسفکردن بێت.

رازاندنەوە یان رەنگکردن چییە؟

رازاندنەوە بریتییە لە باسکردنی هەندێك شتی سادە دەربارەی کەسێك، شوێنێك، شەقامێك، یان هەر شتێکی دیکە کە بتوانرێت وەسف بکرێت، بە شێوەیەك بە وشە وێنەی شتەکان بۆ خوێنەر نیشانبدرێت.

گەر بەراورد بکەین لە نێوان ئەم دوو دەستەواژەیەی خوارەوەدا دەبینین جیاوازییەکی زۆر هەیە لە رووی چێژی خوێندنەوە و ئاستی وێناکردنی نووسینەوە:

١- دورگەی بەغدا پارکێکی جوانە لە باکووری بەغدای پایتەخت و گەلێك شوێنی لێیە بۆ کات بەسەربردن و حەوانەوە.

٢- لە باکووری بەغدا کە بە باخی دارخورماکاندا تێپەڕدەبیت و دار پرتەقاڵە پێگەیشتووەکان جێدەهێڵیت، دەگەیتە شوێنێك بە ناوی دورگەی بەغدا کە بە خۆشترین شوێن دادەنرێت بۆ رزگاربوون لە قەرەباڵغی و سەرقاڵی شار. سنووری ئەو شوێنە بە رووباری دیجلەوەیە و لەسێ لاشیەوە دەریاچە دەوریانداوە کە ماسی رەنگاوڕەنگیان تێدایە، باخچە پڕ لە گوڵ و گوڵزارەکانی دورگەی بەغداو یاریگاو چێشتخانە و هۆڵی شایی و زەماوەند و بورجی بەرز بۆ روانین بەسەر دەوروبەردا، بوونەتە هۆی راکێشانی خەڵکی پایتەخت بەرەو ئەو شوێنە.

گەر سەرنج بدەین دەبینین ئەوەی دووهەمیان یەکسەر ناڵێت شوێنێکی خۆشە یان گەلێك شت هەیە کە دەتوانیت لەوێ ئەنجامیان بدەیت، بەڵکو بە وشە پیشانی خوێنەر دەدات کە شوێنێکی چۆنە و خوێنەر لە واقیعی راستەقینەی شوێنەکە نزیکدەکاتەوە و وێنەکانی دەهێنێتە پێش چاوی.



کاتێك ریپۆرتەر خەریکی نووسینی راپۆرتەکەیەتی پێویستە ئەم جۆرە شتانە تۆمار بکات، ئەم شتانە دەبن بە رازاندنەوەیەکی بنەڕەتی بۆ ستۆرییەکەی.

**بەشە سەرەکییەکانی ستۆری لە ستایلی هەرەمی دەستکاریکراودا**

**١- لید**

کورتە چیرۆکێکی مرۆییە کە کێشەی سەرەکی ستۆرییەکە رووندەکاتەوە، واتە لە رێگەی گێڕانەوەی چیرۆکێکی راستەقینەی مرۆیی بە وردەکاری تەواوەوە دەستپێدەکەین، کە کورتە چیرۆکەکە گوزارشت لەو کێشە گەورەیە دەکات کە ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە. پێویستە کورتە چیرۆکەکە بە زمانی وەسف و بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش دابڕێژرێت و لە رێگەی وشەوە رەنگبکرێت.

**٢- راستیە سەرەکییەکان**

لە بەشی دووەمی ئەم ستایلەدا دوای گێڕانەوەی چیرۆکە مرۆییەکە و وەرگرتنی ئیقتیباسی تەواو، راستییە سەرەکییەکانی ستۆرییەکە دەخرێنە روو، لە روونکردنەوەی گرنگی بابەتی ستۆرییەکە و پەرەگرافی پرد و ئەو داتا و زانیارانە دەنووسرێن کە خوێنەر پێویستی پێیانە بۆ ئەوەی زانینی خۆی سەبارەت بە کێشەکە فراوان بکات.

**٣- بەشی رازاندنەوەی دووەم**

لایەنێکی نوێی کێشەکە دەخرێتەڕوو، واتە کورتە چیرۆکێکی مرۆیی تر باس دەکرێت، کە گوزارشت لە کێشە گەورەکە بکات، بەڵام لە دۆخێکی جیاوازدا، بە هەمان شێوە دەبێت بە زمانێکی وەسفئامێز بنوسرێت، بە شێوەیەك بتوانرێت بە وشە وێنە لە ئەندێشەی خوێنەردا دروستبکات.

**٤- بەشی راستییەکانی دووەم**

زانیاری و راستی زیاتر لەسەر ستۆرییەکە دەدات و ئەو بەشانەش رووندەکاتەوە کە لە بەشی رازاندنەوەی دووەمدا باسکراون. ئیدی بەم شێوەیە رۆژنامەنووسەکە بەردەوام دەبێت لە تێکەڵکردنی «رازاندنەوە» و زانیاری تا ئەو شوێنەی بیرۆکەی ستۆرییەکە دەگەیەنێت و سەرجەم لایەنەکانی رووماڵدەکات.

**٥- پەرەگرافی کۆتایی**

لە ستایلی هەرەمی دەستکاریکراو یاخود ستایلی تێکەڵکردنی رازاندنەوەی راستییەکان پەرەگرافی کۆتایی هەمیشە کۆتاییەکی چیرۆك ئامێزە، واتە بە چیرۆکێکی مرۆیی سەرنجڕاکێش و دانوسقە و پەیوەندیدار بە رووداوی ستۆرییەکەوە کۆتای دەهێنرێت بۆئەوەی وێنەیەکی کۆتایی لەلای خوێنەر بەجێبهێڵرێت. بۆ روونکردنەوەی زیاتر بڕوانە هێڵکاری ژمارە دوو، بۆ نموونەی ستۆری کە بە ستایلی هەرەمی دەستکاریکراو نووسراوە، تەماشای ئەم ستۆرییە بکە:



**کورد ماڵ و کەرەستە لە پاشماوەی ئەو تەقەمەنیانە دروستدەکات کە سەردەمێك سەدام لە دژیان بەکاری دەهێنا**

فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی

بەکر مستەفا، ٤١ ساڵ، لەبەر هەیوانی خانووەکەیدا پاڵی بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی خانووەکەی دابوو بەرامبەر ئەو تیشکانەی خۆر کە لەسەر چیاکانی پێنجوێن، کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی عێراق، هەڵدەهات. تەنها شتێك ئەو دیمەنە هێمنانەی دەشێواند ئەوەبوو کە کۆڵەکەکان لە پارچەی دواوەی گوللە هاوەنی تەقیو دروستکرابوون.

بەکر مستەفا وتی «لە دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ کە گەڕاینەوە بۆ ناوچەکەمان، کەرەستەی خانوو دروستکردن زۆر گرانبوو، لەبەر ئەوە لە دروستکردنەوەی خانووەکانماندا پەنامان بۆ ئەو کەلوپەل و پاشماوە سەربازییانە برد کە لە شەڕی ئێران-عێراق بەجێمابوون».

شتێکی سەیرە کە زۆر خەڵك لە هەرێمی کوردستان پاشماوەی سەربازی بۆ مەبەستی مەدەنیانە بەکاردەهێنن ئەو کەرەستانەی کە پاشماوەی چەك و تەقەمەنین و دژی کورد بەکاردەهێنران لەسەردەمی رژێمی سەدام حسێندا.

ماوەی ساڵانێکە، غەریب عەزیز کە جوتیارێکی تەمەن ٦٧ ساڵە و خەڵکی شارباژێرە لە باکووری سلێمانیی، لوولە تۆپێکی سوتاو بەکاردەهێنێت بۆ ئاودانی کێڵگەکەی، غەریب وتی «هیچ رێگە چارەیەکی ترم نەبوو جگە لەمە».

بە هەمان شێوە شیلان عبدالقادر، ٢٨ ساڵ، مامۆستا، قەوانی گوللە تۆپ وەك گوڵدان بەکاردەهێنێت، کە ئێستا لە ماڵەکەیدا قەوانی چەند گوللە تۆپێکی وەك گوڵدان داناوە و گوڵی زەرد و سووریان پێدا شۆڕبۆتەوە، شیلان وتی «لەبەر ئەوەی قەوانی گوللە تۆپ شێوەیان زەرد و درێژکۆلەن، بۆ گوڵدان زۆر جوانن».




حسێن والی، ٤٢ ساڵ، بژێوی خۆی بە شوفێریکردنی ئیڤایەکی رووسی دابیندەکات کە پێشتر لەلایەن گاردی کۆماری عێراقییەوە بەکاردەهێنران. والی ئەو ئۆتۆمبیلەی لە سەربازگەی سەلام لە سلێمانی بە لەکارکەوتوویی دۆزیوەتەوە و چاکی کردوەتەوە و ئێستا بۆ گواستنەوەی خواردەمەنی بەکاریدەهێنێت. بە ئاماژەکردن بۆ هەڵمەتی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ کە تیایدا لە لایەن رژێمی پێشووەوە ١٨٢ هەزار



کوردی تیا سەرنوگم کراو چوار هەزار گوندی تیادا خاپوورکرا، حسێن وتی: «نازانم ئەم ئیفایە چەند کوردی پێ ئەنفال کراوە، بەڵام ئەزانم کە ئێستا بەم ئیفایە، ئەتوانم بژێوی خۆم و خێزانەکەم دابینبکەم».

حاجی مەسیفی، بەڕێوەبەری گشتی کاروباری مین لە ئیدارەی سلێمانی، هۆشیاریدا لەوەی کە بەکارهێنانی پاشماوە سەربازییەکان بۆ مەبەستی مەدەنی سەلامەت نییە.

حاجی مەسیفی وتی»ئێمە بەهیچ شێوەیەك و بۆ هەر مەبەستێك بێت بەلامانەوە باش نییە خەڵکی مەدەنی نزیکی تەقەمەنی و پاشاوەی سەربازی بکەوێتەوە چونکە دواجار ڕەنگە بە مەرگی ئەو کەسە کۆتایی بێت.»

بەڵام بەهۆی ئەوەی کە کەرەستە بنەڕەتییەکان گرانن، ئەم جۆرە هۆشیارکردنەوانە کاریگەرییەکی کەمیان هەیە.

لە کاتێکدا زۆربەی خاشاکە سەربازییەکان بۆ مەبەستی پراکتیکی بەکاردەهێنرێن، بەڵام کەسانێك هەن کە کاری داهێنەرانەیان پێ ئەنجامداون.

هونەرمەند زیرەك میرە، ٢٤ ساڵ، دوای هەڵمەتە سەربازییەکەی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق، کاتێ چووە ناو سەربازگەیەکی چۆڵکراوی سوپای عێراق لە نزیك کەرکوك بیرۆکەیەکی بە خەیاڵدا هات. ئەو چەند هەزارێك پۆستاڵی سەربازی دێنێت. بەڵام لە جیاتی فرۆشتنیان، پەیکەرێکی حەوت مەترییان لێدروست دەکات و لەو جێگەیەدا دایدەنێت کە پێشتر پەیکەرێکی برونزی سەدامی تێدابووە.

زیرەك وتی «ئەو کارەم بۆ ئەوە کرد بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە پۆستاڵە سەربازییەکان زۆر بەنرخترن لەو دیکتاتۆرانەی دەسەڵات و هێزی خۆیان بۆ چەوساندنەوە و ئەتککردنی مرۆڤ بەکار دەهێنن».

## سێیەم: ستایڵی تەرکیز یان(تەشخیس) the focus or personalized style

بۆ نووسینی ستۆری بەم ستایڵە تەرکیز دەکەینە سەر مرۆڤێك، بە هەمان شێوەی ستایڵەکەی تر بە کورتە چیرۆکی مرۆڤێك دەستپێدەکەین کە چیرۆکەکەی گوزارشتە لەو کێشە گەورەیەی ستۆرییەکەی بۆ نووسراوە، واتە لە ڕێگەی کێشەی تاکە مرۆڤێکەوە هێما بۆ کێشەیەکی گەورەتر دەکەین.

لەم ستایڵەدا بوونیادی ستۆرییەکە وەکو بازنەیەکی داخراوی لێدێت، چونکە خاڵی دەستپێکردن و کۆتایی یەك چیرۆکە، بە مانایەکی تر لەم ستایڵەدا بە چیرۆکی ئەو کەسەی دەستپێدەکەین هەر بە هەمان کەس کۆتایی پێدەهێنین. ئەم ستایڵە بریتییە لە بە مرۆییکردنی چیرۆکەکە، چیرۆکی کەسێك یان کۆمەڵە کەسانێك دەگێڕینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەیەك یان ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی گەورەتر کە کاریگەری لەسەر زیاد لە مرۆڤێك هەیە.

**بەشە سەرەکییەکانی ستۆری لە ستایڵی تەرکیزدا**

**١- لید**

بە هەمان شێوەی ستایڵی پێشوو لە ستایڵی تەرکیز یان تەشخیسکردندا، سەرەتا یاخود لید بە کورتە چیرۆکێکی مرۆیی کەسێك یان کۆمەڵە کەسانێك دەستپێدەکەین و تەرکیز دەخەینە سەر لایەنە جیاوازو گرنگەکانی، بە هەمان شێوە دەبێت ئەو خاڵە فەرامۆش نەکەین کە چیرۆکی ئەو کەسەی لە لیددا تەرکیزی دەخەینە سەر پێویستە گوزارشت لەو کێشە گەورەیە بکات کە ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە.

**٢- پەرەگرافی پرد bridge paragraph**

لە ڕێگەی ئەم بەشەوە کە پێویستە بەشێکی زۆری لە زانیاری و ڕاستی پێکهاتبێت، لە چیرۆکە بچووکەکەی ئەو کەسەی دەستمان پێکردووە دەگوازینەوە بۆ ئەو کێشە گەورەیەی ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە.



**٣- لاشە body**

ئەم بەشە لایەنە جیاوازەکانی ستۆرییەکە ڕووندەکاتەوە و کاریگەری کێشە گەورەکە لەسەر ئاستێکی فراوانتر دەخاتەڕوو، تیایدا کورتە چیرۆکی چەند کەسێکی تر لە دۆخی جیاوازدا نیشاندەدات، واتە ئیقتیباس و زانیاری زیاتر پێشکەشدەکات. لەم بەشەدا ڕۆژنامەنووس ڕاپۆرت دەدات لەسەر مەسەلە گرنگەکەی ستۆرییەکە. دەشتوانرێت لەم بەشەدا پەیڕەوی لە هەرەمی هەڵگەڕاوە یان دەستکاریکراو بکرێت.

**٤- دەرەنجام conclusion**

بەشی کۆتایی ستۆرییەکەیە و تەواوکەری هەمان کورتە چیرۆکی نێو لیدی سەرەتای ستۆرییەکەیە، واتە لەم بەشەدا دەگەڕێینەوە سەر چیرۆکی هەمان ئەو کەسەی لە لیدەکەدا بەشێکیمان گێڕاوەتەوە. بە ئیقتیباسێك یان زیاتری ئەو کەسەی لە لیددا تەرکیزمان خستۆتە سەر کۆتایی بە ستۆرییەکە دێنین. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر بڕوانە هێڵکاری ژمارە سێ، بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ستایڵی تەرکیز یاخود تەشخیسدا ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوە:

**خەڵکی لە کاتی سەفەرکردنیاندا بە ڕێگەی بەدناوی**
**بەغدا-کەرکوکدا لە ژیانی خۆیان دەترسن**

**فرمان عەبدولڕەحمان لە کەرکوك و سلێمانی**

لە مانگی تشرینی یەکەمدا، شەماڵ عەبدولکەریم کە بازرگانێکی کوردە بە (BMW) تازەکەی لە بەغداوە بەرەو کەرکوك دەهات و لەناکاو لەسەر ڕێگەی عوزێم کەوتە کەمینی چەند چەکدارێکەوە. چەکدارەکان سەیارەکە و ئەو سێ دەفتەر دۆلارەی بۆ کڕینی کەلولوپەل پێی بوو لێیانسەند. بەوەشەوە نەوەستان بۆ ماوەی دوو هەفتە لە خانوویەکدا زیندانیان کرد و لەو ماوەیەدا لێیاندەدا و نان و ئاوێکی کەمیان دەدایە. دواجار فڕێنەرەکانی بەرامبەر بە پێنج دەفتەر دۆلار بەرەڵایانکرد کە کەسوکارەکەی دایان.

هەرچەندە فڕێنەرەکانی بانگەشەی ئەوەیاندەکرد کە ئەندامی گرووپێکی ئیسلامین بەڵام شەماڵ خۆی پێیوایە تاوانباری ئاسـایی بـوون مەبەسـتیان دەسـتکەوتنی پـارە بوو.شەماڵ وتی «ئـەو چـەکدارانە خـاوەنی هـیچ ڕەوشـتێکی مرۆڤانـە نـین، ئەوانـە دڕندەن».

لە کاتێکدا هیچ ئامارێك لەبەردەستدا نییە سەبارەت بە ژمارەی ئـەو کەسـانەی لەسەر ڕێگەی عوزێم فڕێنراون، بەڵام بە خێرایی ناوبـانگێکی خراپـی دەرکـرد وەکـو یەکێك لە ترسناکترین ڕێگە سەرەکییەکانی عێراق تا ئەو ڕادەیەی کورد بە «ڕێگـەی مردن» ناوی دەبەن.

لە مانگی ئابی ٢٠٠٥دا کاروانی پاسەوانەکانی جەلال تاڵەبانی سەرۆك کۆمـاری عێراق لەسەر ئەم ڕێگەیە کەوتنە بەر هێرش و پێنج پاسەوانیان لێکوژرا.

ڕێگەی عوزێم بە ناوی قەزای عوزێمەوە ناونراوە و درێژییەکەی ١١٠ کیلۆمـەترە و هەمووی دەشتاییە و ڕێگای سەرەکی نێوان پایتەخت و باکووری وڵاتە.

لەبەرئەوەی ئەم ڕێگایـە ڕاسـتەوخۆترین ڕێگایـە بـۆ بەغـدا، لـەدوای ڕووخـانی سەدامەوە ئەم ڕێگەیە زۆر بـەکاردەهێنرا دوای ئـەوەی خـەڵکانی کـورد ئـەیانتوانی سەفەربکەن بۆ بەغدا.

لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا چەکداران تارماییان بەسەر ئەو ڕێگەیـەوە هـەر مـاوە و کورد ئەخەنە کەمینەوە و ئەیانفڕێنن. بە پێی وتـەی شـایەد حاڵـەکان هەنـدێك لـەو گرووپە چەکدارانە بۆ پارە ئەچنە سەر ئەو ڕێگایـە و کـورد ئەکەنـە ئامـانج چـونکە پێیانوایە لە عەرەب دەوڵەمەندترن.

هەندێکی تریان پاشماوەی ڕژێمی بەعسن کـە بـۆ ماوەیـەکی زۆر کوردیـان وەکـو دوژمنی خۆیان سەیردەکرد. هەنـدێکی تریـشیان گرووپـی ئیـسلامین کـە کـورد بـە هاوکاریکردنی سەربازانی ئەمریکا تاوانباردەکەن.






**هەنگاوەکانی تەتبیقکردنی بونیادی تەرکیز (یان تەشخیس)**

بەگوێرەی سەرچاوەکانی پۆلیس لە کەرکوك، هەندێکجار ئەو گرووپانە لەناویەکدا هاوکاری یەکتری دەکەن و قوربانییـەکان بـە یـەکتری دەفرۆشـنەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا پاراستنی ئەو ڕێگایە لەلایەن پۆلیسەوە کارێکی زەحمەتە چونکە عوزێم بەشـێکە لـە پارێزگای تکریت کە لەلایەن هێزێکی پۆلیسەوە کۆنترۆڵکراوە کە زۆربەیان عـەرەبن و پەیوەندیان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی کەرکوکدا نییە کە زۆربەیان کوردن.

زۆرێك لەوانەی بـەو ڕێگایـەدا سـەفەردەکەن دەڵـێن عەشـیرەتەکان و هێزەکـانی پۆلیس یارمەتی فڕێنەران دەدەن و پۆلیسیش چاوپۆشیان لێدەکەن.

شەماڵ ئاماژەی بەوەکرد یەکێك لەو کەسانەی ناسیوەتەوە کە لێیدابوو کوڕی سەرۆك عەشیرەتێکی ئەو ناوچەیەیە کە تیایدا فڕێنرابوو. هەروەك وتیشی «زۆربەی ئەو ڕێکەوتنانەی چەکدارە یاخیبوەکان لەگەڵ کەسوکاری فڕێنراوەکاندا دەیکەن بۆ وەرگرتنی پارەکان لە ڕێگەی سەرۆك عەشیرەتەکانەوە دەکرێت».

هەر لەو چوارچێوەیەدا کاتێك نوری حەمەساڵح، شۆفێری تەکسی، لە مانگی کانونی یەکەمی ٢٠٠٥دا فڕێنرا و سەرباری فڕاندنەکەشی ئازاریش درا، کەسوکاری هانایان بردە بەر پۆلیس و داوای یارمەتیان لێکردن. پۆلیس پێیان وتبوون کە ئەو ٣٢ دەفتەر دۆلارە بدەن کە فڕێنەرەکان داوایانکردووە بۆ ئەوەی ئازادی بکەن.

نوری بە گلەییەوە وتی: «پۆلیسی عێراقی هێزی زیاتری بە (فڕێنەرەکان) بەخشیوە.»

لە مانگی کانونی یەکەمی ٢٠٠٥دا پۆلیسی کەرکوك دوانیان لە گەورەترین فڕێنەرەکانی ڕێگای عوزێم دەستگیرکرد. بەرپرسانی پۆلیس دەڵێن ئەو دوانە دانیان بەوەدا ناوە کە ٧٠ کوردیان فڕاندووە، کە یان کوشتوویانن یاخود بە پارە ئازادیانکردوون. هەروەها دانیشیان بەوەدا ناوە کە لاقەی چەند ئافرەتێکیان کردووە.

هەرچەندە کردەوەکانی فڕاندن دوای دەستگیرکردنەکان کەمبووەتەوە بەڵام ڕێگەی عوزێم هەر بە مەترسیداری ماوەتەوە.

عەتا عوسمانی بەڕێوەبەری کۆمپانیای چیا بۆ گواستنەوە وتی: «بەهۆی مەترسی ئەو ڕێگایەوە، شۆفێرەکانم سەفەرکردنیان بۆ بەغدا ڕاگرتووە و ئەمەش زیانی بە ئیشەکەمان گەیاندووە».

شەماڵ عەبدولکەریم کە ئێستاش یادی ئەو ڕۆژە ناخۆشانەی بیرناچێتەوە کە لە ژێر دەستی رفێنەرەکاندا بەسەری بردووە، وتی «ئەو چەکدارانە کاتێك کە کوردێك دەگرن وا دەزانن کانێکی ئالتونیان دۆزیوەتەوە»، هەروەها وتیشی «ئەوان داوای هەرچییەکیان کرد دەبێت بیاندەیتێ، ئەگەر نەشتبێت دەبێت بۆیان پەیدابکەیت ئەگینا دەتکوژن».



## چوارەم: بوونیادی کاتژمێری خۆڵی

لەم ستایڵەدا گرنگی سەرەکی دەدرێت بە پەرەگرافەکانی لید و کۆتایی، بە شێوەیەك ئەو دوو بەشە لە رووی پێکهاتەی ستۆرییەکەوە دەبنە دوو جەمسەری سەرەکی و پەرەگرافەکانی تر وەك پاڵپشتێکیان لێدێت بۆ ئەو دوو خاڵە (لید، کۆتایی). بە مانایەکی دی لەم شێوازەدا لید و کۆتایی دەبنە دوو پێکهاتەی سەرەکی و تەواوکەری یەکتر، کە تیایدا زانیارییە گرنگ و جەوهەرییەکان لە لیدەوە دەست پێدەکات و دواتر پەرەگرافەکانی تر بە شێوەیەکی پلەرێژی گرنگیان کەم دەبێت تاوەکو ناوەڕاستی ستۆرییەکە، پاشان جارێکی تر پەرەگرافەکان پڕ دەبنەوە لە زانیاری گرنگ و بابەتی جەوهەری تا دەگاتە پەرەگرافی کۆتایی کە بە هەمان شێوەی لیدەکە دەبێتە پەرەگرافێکی گرنگ و جەوهەری ستۆرییەکە و وێنەی گشتی و تەواوی رووداوەکە بەرجەستە دەکات. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە هێڵکاری ژمارە چوار.




ستایلی کاتژمێری خۆڵی

## بەشەکانی ستۆری لەم ستایلەدا

**١- لید:**

لیدی ئەم ستایلەش بە هەمان شێوەی ستایلەکانی تر دەکرێت کورتە چیرۆکێکی مرۆیی بێت کە کێشەی ئەو کەسەی چیرۆکەکەی دەگێڕینەوە تەعبیر بێت لەو کێشە گەورەیەی ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە. یاخود دەکرێت هەر یەکێکی تر بێت لەو جۆرە لیدانەی کە دواتر بە شێوەیەکی درێژتر لەبارەیانەوە دەدوێین.

**٢- نێتگراف یان پەرەگرافی پرد**

هێڵی گشتی چیرۆکەکە دەخرێتەڕوو پشت ئەستوور بە زانیاری و ئیقتیباسی گرنگ و سەرنج ڕاکێش، ڕۆژنامەنووس لە کاتی پەیڕەوکردنی ئەم ستایلەدا پێویستە ئەوە لە بەرچاو بگرێت کە پەرەگرافەکان لە ڕووی گرنگییەوە وردەوردە قورساییان دادەبەزێت تا خاڵی ئینتیقالکردنی دووەم.

**٣- درێژەپێدان**

لەم بەشەدا دەکرێت ئەو شتانە باسبکرێت کە لایەنی جوانکاری و تام و چێژ بۆ ستۆرییەکە فەراهەم دەکات، هەروەك ئەو شتانەش یادی خوێنەر دەهێنرێتەوە کە ڕۆڵیان هەبووە لە دروستکردن و پەرەپێدانی کێشەی ستۆرییەکە، ئەم بەشە ناسەرەکیترین بەشی ستۆرییەکەیە و کەمترین زانیاری تێدایە.

**٤- نێتگراف یان پەرەگرافی پردی دووەم**

لەم بەشەدا جارێکی دی زانیاری تازە و گۆشەی جیاوازی تری ڕووداوەکە باسدەکرێن و زانیاری و ئیقتیباسی سەرنج ڕاکێش و کورتە چیرۆکی مرۆیی دیکە دەخرێنەڕوو بە شێوەیەك گۆشەی سەرەکی ستۆرییەکە نەشێوێنرێت.

**٥- ڕوونکردنەوە**

وردەکاری و تەفاسیلی تر باسدەکرێت کە تیایدا هۆشیاری خوێنەر سەبارەت بەڕووداوەکە فراوانتر دەکات و بیروڕای لایەنە جیاوازەکانی نێو کێشەکەی بۆ بەیان دەکرێت، لێرەدا دوا بەشەکانی وێنەی سەرەکی ڕووداوەکە پیشاندەدرێت لە ڕێگەی پێشکەشکردنی زانیاری نوێ



و تازەوە، هەروەك پێشینەی ڕووداوەکان فراوان دەکرێت و ئەوەی ماوە ڕوومالبکرێت لەم بەشەدا باسدەکرێ.

**٦- کۆتایی**

لە ستایلی (کاتژمێری خۆلی)دا کۆتایی پێهێنان هێندەی لید گرنگە ئەویش بۆ ئەوەیە خوێنەر لەگەڵ ڕووداوەکەدا بهێڵرێتەوە و ناچاربکرێت لە سەرەتاوە تا کۆتایی لەگەڵ ستۆرییەکەدا بێ، پەرەگرافی کۆتایی لەگەڵ لیددا دوو پێکهاتەی سەرەکی و تەواوکەری ستۆریین لەم ستایلەدا. لەم ستایلەدا کۆتایی پێهێنان بە زۆریی کۆتایی پێهێنانی (پوختەیی)ە، واتە پوختەی ڕووداوەکە جارێکی ترو بە زمانێکی دیکە بۆ خوێنەر باسدەکرێت لەگەڵ ئیقتیباس و زانیاری زیاتر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت چەند شێوەیەکی تری کۆتایی پێهێنانی تێکەڵبکرێت وەکو کۆتایی پێهێنانی (پرسیاریی) کە تیایدا بە پرسیارێکی جەوهەری کۆتایی بە ستۆرییەکە دەهێنرێت کە بەهۆیەوە پەیوەندی لەگەڵ بیرکردنەوەی خوێنەردا سەبارەت بە ڕووداوەکە دەهێڵرێتەوە. یان کۆتایی پێهێنانی (ئیستینتاج) تێکەڵدەکرێت کە لە ڕێگەی خستنەڕووی بیروڕا جیاوازەکانی ئەو لایەنانەی بەشدارن لە کێشەکەدا جۆرێك لە گریمانە و دەرەنجام پێشکەشدەکرێت.

بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ستایلی (کاتژمێری خۆلی) ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوە :

### ئەکادیمیانی عەرەب بە لێشاو ڕوودەکەنە کوردستان

**زەینەب ناجی لە بەغدا و فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی**

مامۆستا عەلی عەبدولوەهاب، ٥٠ ساڵ، شیعەیە و لە گەڕەکی جامیعە ئەژی کە گەرەکێکی زۆرینە سوننەیە لە بەغدا. مامۆستا عەلی وانەی ئەندازیاری دەووتەوە لە زانکۆی تەکنیکی بەغدا، بەڵام ڕۆژێکیان هەڕەشەی لە سوننە توندڕەوەکانەوە بەدەستگەیشت بۆ بەجێهێشتنی ناوچەکە.

ئەو مامۆستایە کە دوو هاوەڵی لەلایەن توندڕەوەکانەوە کوژراون وتی «ناتوانم چیتر لێرە بژیم یان ئیش بکەم». هەربۆیە بڕیاریدا پایتەخت بەجێبهێڵێت و ڕووبکاتە سلێمانی لە کوردستانی عێراق. ئێستا لە زانکۆی سلێمانی وانە دەڵێتەوە.

ژیانی ئەکادیمی لە بەغدا و ئەو شارانەی تر کە بارودۆخی ئەمنی تیایاندا ئارام نییە، جۆرێك لە وەستانی توش بووە، بەو پێیەی زۆرێك لە ستافی ئەکادیمی یان چوون بۆ هەندەران یان ڕۆشتوون بۆ پارێزگا ئارامەکان، هەر لەو چوارچێوەیەدا نزیکەی ٢٠٠ مامۆستا و مامۆستای یاریدەدەر بەغدادیان بەجێهێشتووە و ڕوویانکردۆتە کوردستانی عێراق، لەبەر ئەوەی ئارامی تێیدا بەرقەرارە.

وادیارە چەکداران شەڕیان ڕاگەیاندووە لە دژی نوخبەی فێرکاری وڵات، لەو کاتەوەی ڕژێمی سەدام روخێنراوە لە نیسانی ٢٠٠٣ دا نزیکەی ٢٨٠ مامۆستای زانکۆ و ئەکادیمی کوژراون. ئەم هەفتەیە ژمارەی قوربانیان زیاتر بوو کاتێك چەکداران هێرشیان کردە سەر زانکۆی موستەنسەریە و لانی کەم ٧٠ قوتابی و کارمەندیان کوشت و ١٣٨ یشیان بریندارکرد لە میانەی خوێناویترین کاری توندوتیژیدا لەمساڵدا.

مانگی ١٠ی ساڵی ٢٠٠٦، چەکداران ڕایانگەیاند کە هێرش دەکەنەسەر مامۆستایان و قوتابیان ئەگەر واز لە کۆلێژەکانیان نەهێنن. بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك، ژمارەی قوتابیان بەشێوەیەکی ترسناك کەمبووەوە. بەڵام بە هێواشی دەستیانکردەوە بە خوێندن، لەگەڵ ئەوەشدا هێرش و هەڕەشەکان نەوەستان.

لە مانگی ١١ی ساڵی ٢٠٠٦، ڕاگری کۆلیژی ئابووری زانکۆی بەغدا تیرۆرکرا. پاشان دوای چەند ڕۆژێکی کەم، ژمارەیەك لە کارمەندانی وەزارەتی خوێندنی باڵا بە ڕۆژی ڕووناك ڕفێنران لەلایەن کۆمەڵێك چەکدارەوە کە جلوبەرگی هێزی وەزارەتی ناوخۆیان لەبەردابوو.

سەرباری ئەوانەش زانکۆکان هێشتا هەر کراوەن، بەڵام کەم تا زۆر چۆڵن، هەرچەندە حەرەمی زانکۆکانیش لەلایەن پۆلیس و سوپاوە پاسەوانی دەکرێن، لەگەڵ



ئەوەشدا کارمەندان و قوتابیان هەرکات بینای زانکۆکانیان بەجێدەهێڵن هەستدەکەن نێچیرێکی ئاسانن بۆ چەکداران.

مامۆستا عەلی خانوویەکی لە سلێمانی بەکرێگرتووە بۆ خێزانەکەی و بە وتەی خۆی بارودۆخی باشە، ئەو وتی «هەست بە ئارامی دەکەم لە ئیشکردنما لێرە، هاوەڵەکانم بەتەواوەتی متمانەم پێدەکەن و پەیوەندیش لە نێوان مامۆستا عەرەب و کوردەکاندا زۆر باشە».

هەندێك لە کۆلیژەکان لە بەغدا لەوەدان داخرێن چونکە نزیکەی هەموو مامۆستاکان کۆچیانکردووە. لە کۆلیژی دەرمانسازی، ژمارەی کارمەندەکان لە ١٢ەوە دابەزیوە بۆ ٢ کارمەند و ئەو مامۆستایانەی دەرچووی تازەن خراونەتە جێگەی ئەوانەی ڕۆیشتوون.

بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر، زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر تەنها زانکۆ بوو لە باکووری وڵاتدا. دوای ڕاپەڕینی کورد لە ئاداری ١٩٩١ دا، کاتێك پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێر و دهۆك بارێکی نیمچە ئۆتۆنۆمیان وەرگرت، دوو زانکۆی تازەی تر لە سلێمانی و دهۆك کرایەوە.

زانکۆ کوردییەکان بەشێوەیەکی سەرەکی پشتبەستووبوون بە خەڵکانی ئەکادیمی کوردی ناوخۆیی و ئەوانەی لە هەندەران دەگەڕانەوە، چونکە پەیوەندیان لەگەڵ زانکۆکانی بەشەکانی تری عێراق نەبوو.

دوای ٢٠٠٣، هاتنی مامۆستا عەرەبەکان ژیانی ئەکادیمی لە کوردستان بووژاندەوە و هانی دەسەڵاتە فێرکارییە کوردییەکانیدا چەند کۆلیژێك فراوان بکەن تا خواستی ڕوولەزیادی ناوخۆیی لەسەر خوێندنی باڵا دابینبکەن.

مامۆستا ئاراس دارتاش، ڕاگری کۆلیژی بەڕێوەبردن و ئابووری لە زانکۆی سلێمانی، وتی «ئەگەر ئەو مامۆستا عەرەبانە نەهاتنایە وانەوتنەوە لە زانکۆی سلێمانی کێشەی تێدەکەوت». تەنها لەم کۆلیژەدا ١١ مامۆستا و مامۆستای یاریدەدەر هەیە کە لە ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە هاتوون.

مامۆستا ئاراس وتیشی «ئەو مامۆستایانە یارمەتییەکی باش دابیندەکەن، بە تایبەت لە سەرپەرشتیکردنی قوتابیانی ماستەر و دکتۆرادا».

حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵدەدات هانی مامۆستایانی عەرەب بدات بێن بۆ ئێرە لە ڕێگەی ئەوەوە کە یارمەتی دارایی دەخاتە بەردەمیان. مامۆستایانی سەڵت ٣٠٠ هەزار دیناری عێراقی وەردەگرن لە کاتێکدا ئەوانەی خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیان دەهێنن ٥٠٠ هەزار دینار وەردەگرن وەکو یارمەتیەك بۆ کرێ خانوو.

بەڵام مەسەلەکە لایەنێکی سلبی هەیە، نە تەنها ئەو لایەنە دیارەی کە خوێندنی باڵا لە بەشەکانی تری وڵاتدا پێوەی دەناڵێنێ. بەڵکو زۆرێك لە قوتابیانی زانکۆکانی کوردستان زمانی عەرەبی بە باشی نازانن، چونکە لە ماوەی حوکمی ئۆتۆنۆمیدا لە نەوەدەکاندا زۆرێکیان تەنها بە کوردی خوێندوویانە.

ئاریان قادر، قوتابی لە کۆلیژی بەڕێوەبردن و ئابووری، لە کۆرسێکی وانەیەکدا کەوتووە کە مامۆستایەکی عەرەب دەیڵێتەوە. ئاریان وتی «ئەزانین ئەو مامۆستایانە شارەزان، بەڵام لێیان تێناگەین چونکە بە عەرەبی وانە ئەڵێنەوە».

مامۆستا ئاراس بەرگری لە دامەزراندنی مامۆستای عەرەب دەکات و دەڵێت تەنها هەندێك لە قوتابیان کێشەی زمانیان هەیە و بەمزوانە وەرگێڕ (موتەرجم) دادەمەزرێنرێن بۆ یارمەتیدانیان. هەندێك لە کۆلیژەکان بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم کێشەیەدا بە زمانی ئینگلیزی وانەیان تێدا دەوترێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، تەنها زمان نییە کە بووەتە سەرچاوەی کێشە. سەرکەوت خدر، قوتابی کۆلیژی ددان، سکاڵای ئەوەیدەکرد کە «هەندێك لە مامۆستا عەرەبەکان مەسەلەی سیاسی و تایەفەگەری دەورووژێنن کە هەستی قوتابییە کوردەکان بریندار دەکات». سەرکەوت بیری ناکۆکییەکی کەوتەوە سەبارەت بە دادگاییکردنەکەی سەدام لەگەڵ وانەبێژێکدا کە مەسەلەکەی بە ناعادیلانە ناوبردبوو، ئەمەش قوتابییەکانی تووڕەکرد کە زۆریان لەو خێزانانەن بوونەتە قوربانی شاڵاوی سەدام لە دژی کورد.



بەڵام بەگشتی، زۆربەی خەڵك لێرە هاوڕان لەسەر ئەوەی هاتنی مامۆستا عەرەبەکان لایەنی ئیجابی زیاترە لە لایەنی سلبی بۆ خوێندنی باڵا لە هەرێمی کوردستان.

مامۆستا فەرەیدون محێدین، جێگری ڕاگری کۆلیژی ددان لە زانکۆی سلێمانی کە ١٢ مامۆستای عەرەب تێیدا وانە دەڵێنەوە، شارەزایی ئەکادیمیان بەرز دەنرخێنێت. مامۆستا فەرەیدون وتی «زۆر سوودبەخش بوون»، هەروەك ئاماژەی بەوەشکرد کە چەند کەلێنێك لە پسپۆڕییە جیاوازەکاندا پڕدەکەنەوە.

بەڵام بۆ قوتابیانی بەغدا، کۆچی بەلێشاوی مامۆستاکان تراژیدیایەکی ڕاستەقینەیە. چونکە کە مامۆستاکان ئەڕۆن عادەتەن مامۆستای یاریدەدەری گەنج و تازە ئەزموون جێگەیان دەگرنەوە، حاڵێ حازر ژمارەی مامۆستایان زۆر کەمن بۆ سەرپەرشتیکردنی کاندیدەکانی ماستەر و دکتۆرا.

ئەیاد عەبدوڵا، قوتابی ماستەر لە کۆلیژی زانستی زانکۆی بەغدا، ئاماژەی بەوەکرد تا ئێستا سێ سەرپەرشتیاری گۆڕیوە. لەوبارەیەوە وتی «یەکەم سەرپەرشتیارم، سەرۆکی بەشی بایۆلۆژی، کوژرا، دووەمیشیان ڕۆیشت بۆ هەولێر، بە ڕاستی خەسارەتێکی گەورەی شارەزایی زانستییە».

## جۆرەکانی لید (the type of lead)

ڕۆژنامەنووس هەندێ جار لە دەرەوەی ئەو ستایلانەی باسکران دەتوانێ بۆ دەستپێکردن پشت بە چەند جۆرێکی جیاوازی لید ببەستێت کە یاریدەدەرێکی گرنگ و ئاسانە بۆ نووسینی سەرەتای ستۆری، بەڵام لە کاتی پەیڕەوکردنی هەر یەکێك لەو ستایلانەی پێشوو یاخود هەر جۆرێك لەم لیدانەی باسدەکرێن نابێت ڕەگەزە سەرەکییەکانی ستۆری لە یاد بکرێن، چونکە بەرجەستە کردنی ڕەگەزە سەرەکییەکانی ستۆری کە لە بەشی پێشووتردا ئاماژەمان بۆ کردن، زامنی پرۆفیشناڵ بوونی ستۆری دەکات. وەکو باسیشی لێوەکرا لید گرنگترین بەشی ستۆرییە و پێویستە ڕاستەوخۆ

خوێنەر کەمەندکێش بکات و وای لێبکات هەموو چیرۆکەکە بخوێنێتەوە. دەبێت ڕۆژنامەنووس وەکو قولاپێك بڕوانێتە لید بۆ ئەوەی کە خوێنەری گرت تا کۆتایی ستۆرییەکە لەگەڵ خۆیدا بیبات. دەشێت لید چەند پەرەگرافێك درێژ بێت بەڵام پێویستە ئەو پەرەگرافانە روون و کورت و پوخت نووسرابن. پێنج جۆری سەرەکی لید هەیە بەم شێوەیەی خوارەوە:

**۱- لیدی چیرۆك ئامێز (anecdotal lead)**

بریتیە لەو سەرەتایەی کە بە شێوازێکی چیرۆکئامێز هێڵکاری چونە ناوەوەی ستۆرییەکە دادەڕێژێت و تیایدا لە ڕێگەی گێڕانەوەی کورتە چیرۆکێکی مرۆیی کرۆکی ستۆرییەکە نیشاندەدات، واتە هەر لەسەرەتاوە پێویستە بە زمانێکی چیرۆکئامێزانە بە خوێنەر بوترێت کە کێشەی سەرەکی ستۆرییەکە دەربارەی چی دەدوێت. لە کاتی بەکارهێنانی ئەم جۆرە لیدەدا دەبێت ڕۆژنامەنووس لانیکەم هەندێ لە توخمەکانی چیرۆکی ئەدەبی بەکاربهێنێت وەکو عاتیفە و ورووژاندن و دراما، بەڵام بە ئەندازەیەك بێت کە زمانە ڕۆژنامەنووسییەکە فەرامۆش نەکات. بۆ نموونەی ستۆری کە بە لیدی چیرۆکئامێز نووسراوە ئەم ستۆرییەی خوارەوە بخوێنەرەوە:

### بازاڕی پاسپۆرتی ساختە بۆ گەیشتن بە خۆرئاوا پەرەدەسێنێت

**فرمان عبدولڕەحمان لە سلێمانی**

سیامەند عوسمان تەنها ٤٨ سەعاتی خایاند بۆ ئەوەی لە عێراقەوە بگاتە ئەڵمانیا بە پاسپۆرتێکی تەزویری ئەڵمانی. کاتێك ساڵی پار گەیشتە ئەوێ، پاسپۆرتەکەی دڕاند و خۆی تەسلیمی پۆلیس کرد. دواجار بە پەنابەر تۆماریان کرد و ڕێگەی پێدرا لەو وڵاتەدا بمێنێتەوە. ئێستا ئەو لە کارگەیەکی ئامادەکردنی گۆشت لە ئەڵمانیا کاردەکات و ناوی خۆشی گۆڕیوە. سیامەند کە بە تەلەفۆن بۆ IWPR دوا، وتی «من هەرگیز باوەڕم نەدەکرد پاسپۆرتێکی ساختە بمگەیەنێتە ئەوروپا».



کڕینی پاسپۆرتی ساختە بووەتە کاسپییەکی باش لە عێراقدا چونکە خەڵك ئەیانەوێت وڵاتەکە بەجێ بهێڵن بۆ دەربازبوون لە توندوتیژی و بێکاری و چەندین کێشەی تر. تەنانەت لە سلێمانیشدا کە وەك ئارامترین ناوچە و لەرووی ئابووریشەوە باشترە لە عێراق، کەچی خەڵکەکەی هێشتا چاو بۆ ئەوە دەگێڕن بچنە دەرەوە.

بەڵام دەرباز بوون لە عێراق بە ڕێگەی نایاسایی باجەکەی گرانە، چونکە نرخی بەڵگەنامەی ساختە بۆ سەفەر نزیکەی ٨٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکییە- و هەمیشەش ئەگەری گرتن لە ڕێدایە.

کەسێك کە پاسپۆرت تەزویر دەکات، بەو مەرجەی کە ناوی نەبرێت بە IWPRی ڕاگەیاند کە لە ماوەی حەوت ساڵ کارکردنیدا نزیکەی ٥٠٠ نەفەری ڕەوانەی وڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپا کردووە لە ڕێگەی فرۆکەخانەی دیمەشقەوە لە وڵاتی سوریای دراوسێی عێراق. ئەو کەسە پاسپۆرت لەو کوردانە دەکڕێت کە لە ئەوروپاوە دەگەڕێنەوە بۆ عێراق و نیازیان نییە بڕۆنەوە.

ئەو (تەزویرچییە) وتی: «ئەم پیشەیەی من ئەگەرچی زۆر مەترسیدارە بەڵام قازانجێکی بێسنووری لێدەکەم». هەروەك ئاماژەی بەوەشکرد کە بە زۆری پاسپۆرتی ئەڵمانی تەزویر دەکات، بەوپێیەی وێنەکانیان بە ئاسانی لێدەبنەوە. هەروەها پاسپۆرتی عێراقیش ئەوانەی ( ڤیزا ) ی مانەوەی وڵاتانی ئەوروپایان لەسەرە زۆر «ئاسان»ن چونکە ئەو دەتوانێت مۆری پێویستی پاسپۆرتەکەی لە بەغداد دەسکەوێت بە دە دۆلار.

دەسەڵاتدارانی ناوخۆیی هەوڵدەدەن بنەبڕی بازرگانی پاسپۆرتی نایاسایی بکەن. بەپێی وتەی بەرپرسێکی ئاسایشی سلێمانی کە نەیویست ناوی ببرێت، لە مانگی ئایاری ٢٠٠٥ دا باندێکی تەزویرکردنی پاسپۆرت و دراو دەستگیرکران. ئەو کەسانە بە دراوی تەزویرکراوی عێراقی و بەڵگەنامەی سەفەری ساختە گیران و لە ناویشیاندا بەڵگەنامەی مانەوەی بەریتانیا هەبوو.

ئەو بەرپرسەی ئاسایش وتی «ئێمە هەمیشە ئامادەباشین بۆ ئاشکرا کردنی ئەو تەزویرچییانە»، هەروەها وتیشی «ئەوانە مەترسی گەورەن لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتەکەمان و وڵاتانی تریش بە گشتی».

هەندێك لەوانەی هەوڵدەدەن نایاساییانە بگەنە ئەورووپا هەمیشە بەخت یاوەریان نابێت، کارزان جەلال ٨٠٠٠ دۆلاری دابوو بە پاسپۆرتێکی عێراقی کە ڤیزای مانەوەی وڵاتی نەرویجی پێوەبوو. مانگی نیسان ئەو سەفەری دەست پێکرد هەتا گەیشتە فرۆکەخانەی دیمەشق، لەوێ دەسەڵاتداران ئاشکرایانکرد کە پاسپۆرتەکەی نایاساییە. کارزان وتی «من بێ بەخت بووم، ئەگینا هەر لەگەڵ مندا بەو جۆرە پاسپۆرتانە کچێك توانی بڕواتە وڵاتی سوید».

کارزان لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی پارەکەی وەربگرێتەوە چونکە بەڵێننامەیەکی ئیمزا کردبوو کە ئاماژە بەوە دەکات ئەگەر گیرا یان نەیتوانی بگاتە جێگای مەبەست بەهۆی هەر هۆکارێکەوە، ئەوا ئەو کەسەی پاسپۆرتە تەزویرەکەی پێفرۆشتووە بەرپرسیارنییە.

سەرباری ئەو مەترسییانەش هەندێ کەس هەر بێ ئومێد نەبوون، چۆمان عزەدین، ٢٦ ساڵ، هێشتا بە هیوایە بچێتە هەندەران.چۆمان وتی «من خاوەنی بڕوانامەی زانکۆم بەڵام لە ئایندەی خۆم دڵنیانیم لەبەر ئەوە ناچارم سەفەر بکەم بۆ وڵاتە ئەورووپییەکان»، هەروەها وتیشی «لێرە کەس ڕێز لە بەهرەو تواناکانی گەنج ناگرێت».

## ٢- لیدی وەسفی (descriptive lead)

بە پشتبەستن بە تەکنیکی وەسفکردنی شتەکان لە ڕێگەی ڕەنگکردن ورازاندنەوە و خستنەڕووی وردەکارییەکانەوە بە وشە وێنە لە ئەندێشەی خوێنەردا دروستدەکرێت. واتە ئەم جۆرە لیدە وێنەیەك لە بیری خوێنەردا دەکێشێت و بەکاردەهێنرێت بۆ چێژبەخشین و دەرخستنی ستۆرییەکە لە سیمایەکی مرۆییانەدا، هەندێ جار ئاماژە بە



چەند وردەکاری و زانیارییەك دەکرێت کە ڕەنگە لە ستۆرییەکەدا شتی بنەڕەتی نەبن، بەڵام باسکردنیان ڕوخسارێکی ڕاستەقینە و بەتام دەبەخشنە ستۆرییەکە و یاریدەی ئەوە دەدەن وێنەی دیمەنەکان بە تەواوی لە ئەندێشەی خوێنەردا بنەخشێنن. بۆ نموونە:

### خواستە نەتەوەییەکانی کورد هێشتا بەهێزە

**فەرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی**

هەموو ڕۆژێك لەگەڵ دەستپێکردنی دەوامی خوێندن لە باکووری عێراق، خوێندکاران دەستدەکەن بە وتنی سروودێکی نیشتمانی «کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندوە، زیندووە و قەت نانەوێ ئاڵاکەمان» ئەمە بەشێکە لەو سروودەی خوێندکاران بەیانیان دەیڵێنەوە، لەگەڵ بەرزکردنەوەی ئاڵایەکی سەوز و سور و سپی کە خۆرێکی گەش لە ناوەڕاستەکەیدایە، سروودەکە و ئاڵاکە هەردووکیان نوێنەرایەتی کەلەپووری کوردی دەکەن و هیچیان پەیوەندییەکیان بە عێراقەوە نییە.

هەردوو هێزی کۆلۆنیالی بەریتانی و فەرەنسی نزیکەی ١٠٠ ساڵ لەمەوبەر خۆرهەڵاتی ناوەإاستیان دابەشکرد و ناوچە کوردنشینەکانیشیان بەسەر چەند وڵاتێکدا بەشبەشکرد.

سەرباری ئەو ڕاستییەی کوردی عێراق چەندین ساڵە خەباتیانکردوە و هێشتا وڵاتی خۆیان نییە، هەستی نەتەوایەتی (هەستی شانازی کوردایەتی) لە هەر کاتێکی تر لە کوردستانی عێراقدا بەهێزترە.

وەزارەتی پەروەردە هیچ فەرمانێکی دەرنەکردووە بۆ ئەوەی ئاڵای کوردستان هەڵکەن و سروودی ئەی ڕەقیب بڵێن، بەڵام قوتابیان و مامۆستایان هەموو بەیانییەك ئەو مەراسیمە جێبەجێ دەکەن.

ئیبراهیم مەعروف کە بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی سەرەتاییە لە سلێمانی وتی «سروتی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان شێوازێکە بۆ دەربڕینی خۆشەویستی و ڕێز بۆ نەتەوە و ئاڵاکەمان».

دوابەدوای شکڵگرتنی عێراقی دوای سەردەمی بەعس، کوردەکان، کە لە سەردەستی ئەو ڕژێمەدا چەوسێنرابوونەوە، هەوڵدەدەن لە پێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمیدا ئەوەندەی دەکرێت سەربەخۆ لە دەسەڵاتی بەغدا. بەغداش گفتوگۆی مەسەلەی وەکو ناوبردنی ناوچە کوردنشینەکان بە «کوردستانی عێراق» لەگەڵ دەسەڵاتە کوردیەکاندا ناکات، مادام کورد هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ نادەن.

نەوەی نوێ، کە لە سایەی حکوومەتێکی کوردی نیمچە ئۆتۆنۆمیدا پێگەیشتوون دوابەدوای ڕاپەڕینێکی سەرکەوتوو دژی سەدام لە ١٩٩١دا، پەیوەستێکی کەمتریان لە نەوەکانی پێش خۆیان بە دەوڵەتی عێراقییەوە هەیە. زۆرێکیان لە عەرەبی تێدەگەن بەڵام ناتوانن قسەی پێبکەن و هەرگیزیش سەفەریان بۆ ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق نەکردووە.

گزنگ ئەحمەد کە مامۆستایەکی ٢٤ ساڵانە وتی: «تەنها ڕێگە بۆ تەواو ڕزگارکردنی کوردستان ڕاگەیاندنی سەربەخۆییە». هەروەها وتیشی: «ئەجێندای ئێستای هێزە سیاسییەکانی عێراق زۆر لە ئەیدۆلۆژیای حزبی بەعس جیاوازتر نییە».

هەردوو حزبە سەرەکییەکەی کوردستانی عێراق، یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتی خاکی عێراقیان پەسەندکردووە بەوەی کە ڕۆڵێکی سەرەکییان بینی لە داڕشتنی دەستووری نیشتمانیدا، کە دەنگدەران لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥ پەسەندیانکرد. دەستوورەکە مایەی مشتومڕبوو، بە تایبەتی لە نێو توێژی لاوانی کورددا، چونکە ڕێگە بە کورد نادات کە مافی چارەی خۆنووسینیان هەبێت لە ئایندەدا.

دەنگدانێکی نارەسمی کە لە لایەن بزووتنەوەی ریفراندۆمەوە سازکرا لە کاتی هەڵبژاردنەکەی مانگی کانونی یەکەمی ٢٠٠٥دا، دەریخست کە لە ٩٨٪ی ئەوانەی کە بەشداری ئەو دەنگدانەیان کرد دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆیان دەویست.



فەتاح زاخۆیی، وەزیری پێشووی ڕۆشنبیری لە ئیدارەی سلێمانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و چالاککارێك بۆ سەربەخۆیی کوردستان، وتی «بۆ هەموو حزبەکان ئاشکرابووە کە گەلی کورد چی دەوێت».

هەرچەندە کوردەکان چیتر وەك قوربانی تەماشاناکرێن، بەڵام هەستی نیشتمانی هەر بە بەهێزی ماوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی هێزێکی سیاسی سەرەکیش دەگێڕێت لە بەغداد. جەلال تاڵەبانی، سەرکردەیەکی دیاری کورد و سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەشێوەیەکی بەرفراوان چاوەڕواندەکرێت کە بۆ جاری دووەم وەك سەرۆکی عێراق دیاریبکرێتەوە. بەڵام متمانەی خەڵك بە بەغداد و ئیدارەکانی کوردستان زۆر بەهێزنییە.

دیار ئیبراهیم، کە خاوەنی پەڕاوگەیەکە لە سلێمانی باسی لەوەکرد کە داواکاری ئاڵاو نەخشەی کوردستان روو لە زیادبوونە، بەتایبەت لە نێو گەنجاندا، دیارە «خەڵك دەیانەوێت حەز و ئارەزووی خۆیان بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ نیشاندەن بە هەڵکردنی ئاڵاو نەخشەی کوردستان خەون بەوەوە ئەبینن». هەروەها وتیشی «خەڵك ئومێدی بە گۆڕانی سیاسی کەمە و دەیانەوێت جیابن لە عێراق».

### ٣- لیدی پێچەوانە (contrast lead)

لەم جۆرە لیدەدا لە ڕێگەی پیشاندانی دوو رەگەز یان دوو توخمی جیاوازو پێچەوانەوە ئاماژە بە کێشەی ناو ستۆرییەکە دەکرێت، وەکو (تازەو کۆن، نێرو مێ، منداڵ و گەورە، شیعەو سوننە، کوردو عەرەب، پێش سەدامو دوای سەدام). واتە لە ڕێگەی باسکردن و کۆکردنەوەی ئەو شتە دژ بەیەکانەوە دەچینە نێو ئەو گرفتە سەرەکیەوە کە ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە. لە لیدی پێچەوانەدا رۆژنامەنووس لە ڕێگای پیشاندانی دوو بابەتی جیاوازەوە ستۆرییەکەی دەستپێدەکات، جیاوازییەکان باسدەکات، دوێنێ چۆن بوون و ئەمڕۆ چۆنن، هەروەها لایەنە دژەکانیان دەخاتە ڕوو. رۆژنامەنووس لە کاتی بەکارهێنانی ئەم جۆرە لیدەدا لە بری ئەوەی

لیدێکی پوختە بەخوێنەر بڵێت دێت لە ڕێگەی نیشاندانی جیاوازی شتەکانەوە کێشەی ستۆرییەکەی دەخاتەروو. بۆ نموونە:

**لەشفرۆش و موشتەرییەکانیان لە سەرانسەری عێراقەوە ڕوودەکەنە سلێمانی**

**فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی**

هەر لەو کاتەوەی ڕژێمی سەدام حوسەێن ڕووخاوە کاسپی نەسرین کە لەشفرۆش و دەڵاڵە، لە برەودایە. لە دوای ڕووخانی ئەو ڕژێمەوە ئاسانبوونی سەفەرکردن کە بواری بە عەرەبەکان داوە ئازادانەتر بچنە ناوچەکانی کوردەوە باوەڕوایە ئەو ناوچانە سەلامەتترین وەك لە ناوچەکانی تری وڵات، ئەمەش وایکردووە کە زۆر لە لەشفرۆش و موشتەرییەکانیان ڕووبکەنە باکوور.

نەسرین کە ناوی خوازراوە و ئامادە نەبوو ناوی ڕاستەقینەی خۆی بڵێ، وتی «جاران، بە هەزار حاڵ چوار پێنج کەسمان دەسدەکەوت، بەڵام ئێستا ئافرەتمان هەیە لە ڕۆژێکدا کاری سێکسی لەگەڵ ٣٠ پیاودا ئەنجام دەدات».

نەسرین بەشێکە لە تۆڕێکی لەشفرۆشی **٧٣** نەفەری کە هەندێ جار ڕوڵی دەڵاڵێش دەبینێت و لەم کارەیدا نیوەی پارەکەی دەستدەکەوێت، ئاماژەی بەوە کرد کە زۆربەی لەشفرۆشەکان هەژارو بێکارن و لە هەرکەسێك کە کاری سێکسی لەگەڵدا دەکەن ١٠ بۆ ٢٥ هەزار دیناریان دەستدەکەوێت، نەسرین ئەوەشی خستەڕوو کە بڕی ئەو پارەیەی دەستیان دەکەوێت پەیوەندی بەکەسەکەوە هەیە لەبەرئەوە بەرپرسانی حکومی و دەوڵەمەندەکان پارەی زیاتریان دەدەنێ.

نەسرین وتیشی «بێ ئومێدی لە ژیان و هەژاری ئێمەی فێری کاری لەشفرۆشی کرد».

نەسرین و کۆمەڵەکەی سکاڵانامەشیان پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق کردوە و تیایدا داوای ئەوەیانکردووە کە کاری تریان بۆ بدۆزنەوە تا واز لەکاری لەشفرۆشی بهێنن. بەڵام تائێستا وەڵامیان نەدراوەتەوە.



ڕائید موحەمەد تاهیر، فەرماندەی یەکێك لە کەرتەکانی پۆلیسی سلێمانی، دانی بەوەدانا کە لەشفرۆشی بەردەوام لە زیادبووندایە چونکە لەشفرۆشە عەرەبەکان لە ناوەڕاست و باشووری وڵاتەوە دێن بۆ ناوچەکانیان.

بەمدواییانە، گرووپێك کە پێکهاتبوون لە شەش ژنی عەرەب و کوردێك دەستگیرکران، وەك بەشێك لە هەوڵەکانی حکوومەت بۆ بەرگرتن لەو کێشەیە. هەروەها هێزەکانی ئاسایش هەوڵدەدەن بۆ پێشگیریکردن لە تەشەنەکردنی ئەو بازرگانییە، ئەویش بە ڕێگرتن لە سەفەرکردنی ژنان بە تەنها سەفەر بکەن، هەرچەندە بۆ ئەم کارەش هیچ ڕێسایەکی یاسایی نییە کە ڕێگری لە ژنان بکات بە تەنها سەفەر نەکەن.

ڕائید موحەمەد وتی «بەهەموو شێوەیەك ڕێگری کاری لەشفرۆشی دەکەین، چونکە دەرەنجامی خراپی بۆ سەر کۆمەڵگاکەمان هەیە».

بەڵام هەندێ بەرپرسی تری ناو هێزەکانی پۆلیس باوەڕیان وایە کە هەواڵەکان سەبارەت بە زیادبوونی لەشفرۆشی زیادەڕەویان تێداکراوە.

لیوا ڕزگار عەزیز، بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگای سلێمانی، وتی «هەرچەندە کاری لەشفرۆشی بە نهێنی ئەنجامدەدرێ، بەڵام ئێمە دەتوانین کۆنترۆڵی بکەین».

لە بەرامبەریشدا نەسرین وتی «زۆرێك لە پۆلیسەکان خۆیان بەشێکن لە کێشەکە چونکە کاتێ لەشفرۆشێك دەگرن داوای لێدەکەن کاری سێکسییان لەگەڵدا بکەن»، هەروەك وتیشی «ئێمە بێبەشترین توێژی کۆمەڵگاین».

ڕووناك فەرەج، بەڕێوەبەری بەرنامە لە سەنتەری ڕووناکبیری و ڕاگەیاندنی ژنان، کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر لەشفرۆشی، ڕایگەیاند پێویستە بە زوویی کارێك بکرێت. ڕووناك وتیشی: «ئەگەر ئەو دیاردەیە کۆنترۆڵ نەکرێت، نەخۆشی ئایدز ڕەحم بەکەس ناکات، چونکە هۆشیاری سێکسی لێرە زۆر لاوازە».

### ٤- لیدی توندوتیژ (violence lead)

بریتییە لە گێڕانەوەی چیرۆکێکی توندوتیژ یان بەکارهێنانی ڕەگەزێکی توندوتیژ لە گێڕانەوەکەدا بۆ ئەوەی خوێنەر بەسەرسوڕماوی بهێڵێتەوە و وای لێبکات بیەوێت

زیاتر بزانێت دەربارەی کێشەکە، ئەم لیدە لە ریگەی پیشاندانی دیمەنێکی توندوتیژەوە ئەو گرفتە باسدەکات کە ستۆرییەکەی لە پێناودا نووسراوە نەوەك تەنها قسەکردنی ئەبستراکت بێت بە شێوەیەکی راستەوخۆ. بۆ نموونە :

## مەکتەبی کۆمەڵایەتی تارمایی حزبەکان لە دەسەڵاتی دادوەری کوردیدا

**فرمان عەبدولرحمان لە سلێمانی**

لەو کاتەوەی ژنەکەی عەلی ئیسماعیل لەگەڵ دۆستەکەیدا رۆژی ٢٠٠٧/٧/٣١ رەدوو دەکەوێت بۆ دەرەوەی هەرێمی کوردستان و نزیکەی ٦٥٠٠٠ دۆلار و چەند ملیۆنێك دیناری عیراقی، مێردەکەی دەبات، عەلی و براکانی هەموو رۆژێك دەنگە دەنگ و شەڕ و هەرایانە لەسەر ئەوەی چۆن چارەسەری ئەو کێشەیە بکەن.

عەلی ئیسماعیل،٣٩ ساڵ، کە ناوی راستەقینەی خۆی نییە، ئەفسەری پاسەوانی سنوورە و دانیشتووی ناوچەی پشدەرە، دەیەوێت لە رێگەی دادگاوە کێشەکەی چارەسەر بکات و حەقی خۆی وەربگرێتەوە، بەڵام براکانی عەلی پێیانوایە دادگا هیچی بەدەست نییە و پێویستە لە رێگەی مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکانەوە بە سوڵحی عەشایەری حەقی خۆیان لە ماڵی باوکی ژنەکە وەربگرنەوە.

عەلی خاوەنی دوو منداڵە و نزیکەی ١٢ ساڵە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنەکەیدا بەستووە کە مامۆستای سەرەتاییە، خیانەتی خێزانەکەی زۆر کاریگەری لەسەر دەروونی جێ هێشتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی بەوەکرد کە لەبەر ئەوەی خۆی مرۆڤێکی قانونییە دەیەوێت بە یاسا و لە رێگەی دادگاوە چارەسەری کێشەکەی بکات، هەرچەندە ئەو رەخنەشی هەبوو لە دادگا و بەوە وەسفی کردن کە »کەمتەرخەمیان کردووە لە گرتنەبەری رێوشوێنی پیویست بۆ دەستگیرکردنی تۆمەتبارەکان«. لەگەڵ ئەوەشدا عەلی وتی «لە رووی کۆمەڵایەتییەوە هەست بە ئیهانەیەکی زۆر دەکەم و دەشتوانم بە ئاسانی لە رێگەی عەشایەریەوە حەقی خۆم وەربگرم بەڵام دەمەوێت یاسا بڕیاری خۆی بدات».



ئەو جەدەل و گفتوگۆیەی نێوان عەلی و براکانی بەشێکە لەو جەدەلە فراوانەی کە هێزە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی کۆمەڵگە داکۆکی لێدەکەن یاخود دژایەتی دەکەن، ئەویش پەیوەندی بە بەهێزکردنی پێگە و دەسەڵاتی دادگاکان و دانانی سنوورێك هەیە بۆ کەمکردنەوەی دەخالەتی مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان، بە تایبەتی مەکتەبی کۆمەڵایەتی هەردوو حزبی دەسەڵاتداری کوردی یەکێتی و پارتی. ئەویش لە پێناو جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و هەنگاونان بۆ بەرجەستەکردنی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی. یاخود بە پێچەوانەوە هەندێك پێیانوایە باڵادەست بوونی هۆشیارییەکی کۆمەڵایەتی خێڵەکی لە کۆمەڵگەی کوردیدا زەرورەتی بوونی ئەو مەکتەبە کۆمەڵایەتیانەیان بەهێزتر کردووە.

مەکتەبی کۆمەڵایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، یەکێکە لە گەورەترین و باڵادەسترین مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان لە پارێزگای سلێمانی و جگە لەوەی ٢١ ناوەندی هەیە لە شوێنە جیاوازەکانی کوردستان، نزیکەی ١٢٠٠ کارمەندی هەیە و تائێستاش بەردەوامن لە کارکردن و تەنها لە ماوەی حەوت مانگی رابردوودا ٤٠٦ کێشەی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی لەو مەکتەبەدا چارەسەرکراون.

حامید حاجی غالی، بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ئاماژەی بەوە کرد کە یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی مەکتەبی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە قەناعەت بە خەڵکی بکەن برا لە بری برا نەکوژرێت بەڵکو پێویستە تەنها کەسە تاوانبارەکە سزا بدرێت ئەویش لە رێگەی دادگا و قانوونەوە. حامید حاجی غالی وتی: «بەرقەراربوونی هۆشیارییەکی کۆمەڵایەتی خێڵەکیانە لە ناو خەڵکیدا وایکردووە بەهۆی تاوانی کەسێکەوە سەر لەبەری خێزانێك تیابچێت، کە ئەو هەمەجیەتە بە دادگاکانمان چارەسەر ناکرێت ئەگەر ئێمە نەبین». ناوبراو باسی لەوە کرد چەندین کێشەی کوشتن هەبووە کە دوای دەرکردنی سزای لە سێدارەدانی تۆمەتبارەکە لە لایەن دادگاوە، بەڵام کەسوکاری کوژراوەکە بەوە رازی نەبوون و خەڵکی تریان لە بنەماڵەکەی بەرامبەر کوشتۆتەوە. حامید حاجی غالی وتیشی «

هەوڵەکانی مەکتەبی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەیە کە قەناعەت بە خێزانەکان بهێنین بە بڕیاری یاسا و دادگا رازی بن».

ئەگەرچی مێژووی دروستبوونی مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان دەگەڕێتەوە بۆ دوای ڕاپەڕین بە تایبەتی ئەو کاتانەی دەسەڵاتی دادگا و یاسا و دەسەڵاتی جێبەجێ کردن لە کوردستان لەوپەڕی لاوازی و بێهێزیدا بوو، یەکێتی و پارتی بۆ پڕکردنەوەی فەراغی دادگا و قانون بە ناچاری ئەو مەکتەبە کۆمەڵایەتیانەیان دروستکرد بەڵام ئەوەی جێگەی نیگەرانی بەشێکی زۆری پسپۆڕانی بواری یاسا و کۆمەڵگەی مەدەنییە، تا ئێستاش ئەو مەکتەبانە بەردەوامن لە کاری خۆیان و بوونەتە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی دادگاکان و سەروەری قانون.

سامان فەوزی، پسپۆڕی بواری یاسا لە زانکۆی سلێمانی، یەکێکە لەو کەسانەی دژایەتییەکی گەورەی بوونی مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان دەکات و پێی وایە سەرسەختترین بەربەستی بەهێزبوونی دەسەڵاتی دادگا و دروستبوونی کۆمەڵگەی مەدەنین. سامان ئاماژەی بەوەکرد بوونی مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان پێچەوانەی بڕگەیەکی گرنگی ڕەشنووسی هەرێمی کوردستان و دەستووری عیراقە، هەروەها باسیشی لەوە کرد کە پێچەوانەی گرنگترین پرەنسیپی مافەکانی مرۆڤیشە کە یەکسان بوونییەتی لە بەردەم یاسادا. بە ڕای سامان فەوزی بوونی ئەو مەکتەبانە وا دەکات تاوانباران لە بەرامبەر دانی بڕێك پارە بە کەسوکاری کوژراوەکە لە دەست یاسا هەڵبێن و مافی گشتی (حق العام) پێشێل بکرێت. هەروەك وتیشی: «بوونی مەکتەبی کۆمەڵایەتی هۆکارێکی بەهێزی لاوازکردنی دەسەڵاتی دادگایە، چونکە ئەو مەکتەبانە حزبیان لە پشتەوەیە و مەبەستیان ڕازیکردنی خەڵك و ئەندامەکانیانە نەوەکو سەروەری یاسا».

بەڵام بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕەتیکردەوە کە بە هیچ شێوەیەك دەخالەت لە بڕیاری دادگا بکەن و دەست بخەنە کاروبارەکانیانەوە. حامید حاجی غالی وتی «ئێمە ڕێز لە بڕیارەکانی یاسا دەگرین و



سەرەتای هەموو ڕێککەوتنێك بەوە دەکەین کە بکوژەکە تەسلیم بە یاسا بکرێت، بەڵام ئەگەر ئێمە کەسوکاری خاوەن کێشەکە پێکنەخەینەوە ناچار دەچنە تەکیە و دیوەخانی سەرەك عەشیرەتەکان و کێشەی کۆمەڵایەتی تری لێدەکەوێتەوە». لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی یەکێتی دان بەوەدا دەنێت کە ئەرکی مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان لە ئێستادا شێواز و ئاراستەیەکی تری وەرگەرتووە و ئاماژەی بەوە کرد کە پێدەچێت لە ئایندەیەکی نزیکدا وەکو ڕێکخراوی ناحکوومی زیاتر کاری خزمەتگوزاری و خێرخوازی بکەن.

بەڵام بە پێی ئامارەکانی مەکتەبی ناوبراو زۆرترین ئەو کێشانەی کە لەو مەکتەبەدا چارەسەرکراون لە ماوەی **٧** مانگی ڕابردوودا کێشەی کوشتن بووە، لە کۆی **٤٠٦** کێشەی جۆراوجۆر **٥٩** کێشە بریتی بوون لە حاڵەتی کوشتن و برینداربوون.

سامان فەوزی پسپۆڕی یاسا لە زانکۆی سلێمانی پێیوابوو میکانیزمی چارەسەرکردنی کێشەکان لە مەکتەبی کۆمەڵایەتی نادادپەروەرانەیە چونکە وەکو ئەو باسی دەکات ئەگەر کەسێکی سەر بەحیزب یان خاوەن عەشیرەت و دەسەڵات تاوانێکی کوشتن ئەنجامبدات ئەوا لە ڕێگەی مەکتەبی کۆمەڵایەتییەوە بە پارە چارەسەری دەکرێت و لە سزاکەی دوور دەخرێتەوە.

بەڵام حامید حاجی غالی ئاماژەی بەوەکرد کە **٣٧** کێشەی کوشتن لەلایەن خاوەن کوژراوەکەوە عەفو کراون بەڵام لە لایەن دادگاوە سزای خۆیان وەرگرتووە، ئەو وتی «مەکتەبی کۆمەڵایەتی سوڵح بۆ هیچ بکوژێك ناکات، بەڵکو دەیەوێت کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکانی سنووردار بکات».

لە لایەن خۆشییەوە فاروق جەمیل، وەزیری دادی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ئاماژەی بەوەکرد کە تا پێش دوو ساڵ لەمەوبەر مەکتەبی کۆمەڵایەتی تەداخولی هەبووە لە بڕیاری دادگاکاندا، بەشێوەیەك دەسەڵات و پێگەی دادگاکانی لاوازکردبوو. بەڵام بە وتەی ناوبراو ئێستا ئەو تەداخولە نەماوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەزیری داد وتی: «هەر کەسێك تاوانی کرد دەبێت سزای خۆی وەربگرێت بەڵام بوونی سولّحی کۆمەڵایەتی لەوەدا سوودی هەیە کە کۆتایی بە ناکۆکی نێوان دوو بنەماڵەکە دەهێنێ و ئەگەر ئەو سولّحە نەبێت لەوانەیە پەرە بستێنێت».

پێدەچێت هەندێ بڕیاری حکوومەت نێگەتیڤانە رۆڵ بگێڕێت لە بەخشینەوەی دەسەڵاتی مەعنەوی بە بڕیار و نووسراوەکانی مەکتەبی کۆمەڵایەتی. لە مانگی ئایاری رابردوو سەرۆکایەتی هەرێم بڕیاری لێبوردنی بۆ تاوانبارە زیندانییەکانی نێو زیندانەکانی هەرێمی کوردستان دەرکرد، بە پێی رێنماییە هاوپێچەکانی ئەو لێبوردنە دەبوایە زیندانییەکە بڕیاری لێخۆشبوون یان (تەنازول)ی خاوەن حەقەکە هەبێت، لە دادگا بێت یان لە مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان.

گۆنا عەبدوڵلا بەرپرسی بەشی ئافرەتان لە گرتوخانەی سلێمانی ئاماژەی بەوەکرد کە بەهۆی ئەو رێنماییانەوە نادادپەروەری لە لێبوردنەکەدا دروستبووە چونکە ئەوەی لێخۆش بوونی نەبوایە لێبوردنەکە نەیدەگرتەوە و ئەوەشی هەیبوایە لێبوردنەکە دەیگرتەوە، گۆنا عەبدوڵلا وتی: «ئەوەش جۆرێك لە دەسەڵات بەخشینەوە بوو بە مەکتەبی کۆمەڵایەتی حزبەکان» هەروەها وتیشی: «دەبوایە کردار باشی بکرایە پێوەر بۆ ئەو کەسانەی لێبوردنەکە دەیگرتنەوە».

**چەند شێوەکی تری ستۆری:**

بەدەر لەو ستایلّ و جۆرە جیاوازانەی لید کە پێشتر باسمان لێوەکرد، ستۆری بە پێی ئەو ناوەرۆکەی هەڵیگرتووە دەتوانین لە ژێر چەند ناونیشانێکی جیاوازیشدا پۆلێنبەندی بکەین، ئەو شێوانەی تری ستۆری تەنها لە رووی ناوەرۆکەوە جیاوازن دەنا شێوازی نووسینیان هەمان ئەو ستایلانەی پێشووی تێدا پەیڕەو دەکرێ، هەروەك بەرجەستەکردن و هەموو رەگەزە سەرەکییەکانی ستۆریش مەرجێکی دیکەیەو پێویستە رەچاوبکرێ. هەڵبەت ستۆری شێوەی زۆرە و ئەوەی بۆ ئێرە پێویست بێت ئەمانەی خوارەوەیە:



**١- ستۆری کاردانەوە reaction story**

ئەم شێوەیەی ستۆری بۆ لە رووماڵکردنی رووداوە کتوپڕەکاندا گرنگییەکی زۆری هەیە، واتە کاتێك رووداوێکی تایبەت روودەدات مەودای کاردانەوەی ئەو رووداوە و رەهەندە جیاوازەکانی لەسەر کایە جیاوازەکانی کۆمەڵگە ئامانجی ئەم شێوە ستۆرییەیە، بە گشتی ئەم شێوەیەی ستۆری لە بەدواداچوونی رووداوە سیاسی ئابووری کۆمەڵایەتییە کتوپڕەکان یاخود ئەو رووداوانەی کە مەودای کاریگەریان بەرفراوانە و زیاد لە کایەیەك تێدەپەڕێنێ یاخود کاریگەریە جیاوازەکانی بایەخێکی گرنگی لەسەر هاوکێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان هەیە رۆژنامەنووس زیاتر دەتوانێت بەهۆیەوە رووداوەکانی پێ رووماڵ بکات. بۆ نموونە کاردانەوەی دواخستنی مادەی ١٤٠ لەسەر بارودۆخی سیاسی کوردستان، هەڕەشەو هێرشەکانی تورکیا بۆ سەر کوردستان و کاریگەریە ئابوورییەکانی، کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق. بەڵام ستۆری کاردانەوە reaction کاتێك دەنووسرێت کە رووداوەکە رویدابێت واتە رۆژنامەنووس لە رێگەی ستۆرییەکەوە کاریگەری و دەرەنجامەکانی بۆ هاوڵاتیان دەخاتەڕوو. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ستۆری کاردانەوە reaction ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوەی کاردانەوە reaction

## هاوڵاتیانی کورد پێیان خۆش نییە سەربازەکانیان بچن بۆ بەغدا

**فرمان عەبدولرەحمان و فازڵ نەجیب لە سلێمانی**

لەو کاتەوەی سەرکۆی کوڕی توبا عەلی، کە مانگی رابردوو سلێمانی بەجێهێشت و بەرەو بەغدا کەوتە رێ بۆ بەشداریکردن لە پلانە ئەمنییە نوێیەکەی پایتەختدا، توبا بەدەگمەن هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی لەدەست دەچێت و پەرۆشی زانینی دوایین هەواڵی ئەو شارە نائارامەیە.

توبا، ٤٨ ساڵ، زۆر نیگەرانە لەوەی کوڕەکەی بەشدارە لەو هەڵمەتە سەربازییەی کە مەبەست لێی کۆتاییهێنانە بە توندوتیژی تایەفەگەری لە بەغدا. توبا وتی:

«نەدەبوایە پێشمەرگەی کورد بڕۆشتنایە بۆ بەغدا چونکە پاراستنی بەغدا هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە.»

نزیکەی ٣٠٠٠ سەربازی کورد بەشێك دەبن لەو سوپا عێراقییەی کە لە بەغداد بڵاودەکرێنەوە، بەڵام کوردەکان لە باکوور خۆشحاڵ نین بە بەشداریکردنیان لەو هەڵمەتەدا، هەروەك ئاماژە بەوە دەکەن گێڕانەوەی ئارامی بۆ بەغدا کێشەی ئەوان نییە و لەوە دەترسن کە پەلکێشبکرێنە ناو شەڕێکی تائیفییەوە.

هەتا ئێستا کوردەکان کە نزیکەی ١٧٪ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن، خۆیان بە دوور گرتووە لەو شەڕی سوننە و شیعەیەی کە پایتەخت و بەشێکی زۆر لە وڵاتی گرتوەتەوە.

کردەوە سەربازییەکەی بەغدا کە دەیان هەزار سەربازی ئەمریکی و عێراقی بەشداری تێدادەکەن، دوایین هەوڵە بۆ وەشاندنی گورزێك لە چەکداران و میلیشیاکان کە ئەو شارەیان کردووەتە مەیدانی جەنگ.

ئەزمەڕ عەبدوڵا، ٢٧ ساڵ، کە سەربازێکی خەڵکی سلێمانییە، پێش ئەوەی بەرەو پایتەخت بکەوێتە ڕێ بە ئینستیتۆی ڕۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی (IWPR)ی ڕاگەیاند کە ملکەچی ئەمری فەرماندەکانییەتی و بۆ هەر شوێنێك پێی بڵێن دەچێت، بەڵام دوودڵە سەبارەت ئەو ئەرکەی لە بەغدا پێیان سپێردراوە.

ئەزمەڕ وتی: «بە ڕاستی جەنگێکی بیهودە دەبێت چونکە دوژمنەکانی بەرامبەرت دیارنین کێن و چۆن ڕووبەڕووت دەبنەوە.»

کوردەکان پێیانوایە سەربازەکانیان تووشی بارودۆخێکی زۆر قورس دەبنەوە لە پایتەختدا چونکە ئەوان بە شەڕی شاران ڕانەهاتوون، ئەوە جگە لەوەی لەلایەن گرووپە چەکدارەکانەوە وەکو هاوکارانی ئەمریکا سەیردەکرێن، بۆیە دەکرێت ببنە ئامانجی هێرشەکان.

لیوا ئەنوەر دۆلانی، فەرماندەی لیوای سێی سلێمانی ئاماژەی بەوەکرد گەشبین نییە سەبارەت پلانە ئەمنییەکە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستدەکات پێویستە کورد



بەشداریبکات. لیوا ئەنوەر وتی: «خۆشحاڵ نیم بە ڕۆیشتنمان بۆ بەغدا چونکە بەعسییەکان و تیرۆریستەکان خەڵك هاندەدەن زیانمان پێبگەیەنن بە ناوی ئەوەی کە ئێمە بۆ شەڕی عەرەب هاتوینەتە بەغدا».

ئەو فەرماندە سەربازییە کوردە باسی لەوەشکرد سەربازەکانی ئاگاداری ئەرکەکانیان نین لە بەغدا، بەو پێیەی دەسەڵاتداران وردەکاری پلانەکەیان بە نهێنی هێشتوەتەوە بۆ ئەوەی نەهێڵن گرووپە چەکدارەکان و میلیشیاکان پلانەکە پەکبخەن.

لیوا ئەنوەر دۆلانی وتی «ئێمە هەموو هەوڵێك دەدەین نەبینە بەشێك لە شەڕی تائیفی. بەڵام ئێمە سوپای عێراقین و دەچین بۆ پاراستنی گیانی هەموو عێراقییەکان بە کورد و عەرەب و سوننە و شیعەوە».

لەگەڵ ئەوەشدا ترس و دوودڵیەك لەناو ڕیزەکانی سوپای کوردیدا هەیە سەبارەت بەو ئەرکەو هەواڵی ئەوەش هەیە کە هەندێ لە سەربازەکان وازیانهێناوە و لە سەربازی هەڵهاتوون. فەرماندە کوردەکان ئەم هەواڵانە ڕەتدەکەنەوە، بەڵام ئینستیتۆی ڕۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی (IWPR) توانی قسە لەگەڵ سەربازێکی هەڵهاتوودا بکات.

ئەو سەربازە وتی «لەبەر بڵاوبوونەوەی دەنگۆی ئەوەی دەنێردرێین بۆ بەغدا ناچار بووم واز لە سوپا بهێنم چونکە بڕوام بە جەنگێك نییە کە هیچ سوودێکی بۆ کورد نییە». هەروەها پێیوایە کورد باشتر نابێت لە سەربازانی ئەمریکی لە گێڕانەوەی ئارامیدا بۆ پایتەخت. لەوبارەیەوە وتی «هێزەکانی ئەمریکا بەو هەموو ئیمکانییەتەوە شکستی تێدا هێناوە، ئیتر ئێمە چۆن دەتوانین ئەو ئامانجە بەرجەستە بکەین».

بەڵام ڕێبوار کەریم، پسپۆڕی زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی سلێمانی ڕایگەیاند کورد ئەرکی ئەوەیان لە ئەستۆدایە لە بەغدا خزمەت بکەن، چونکە بە بڕوای ئەو پسپۆڕە « ئەوان بەشێکن لەم وڵاتە».

ڕێبوار هەستدەکات شتێکی گرنگە بۆ کورد نیشانی بدەن کە ئامادەن پارێزگاری لە عێراق بکەن و هۆشیاریشیدا ئەگەر وانەکەن خراپ لەسەر کورد دەکەوێتەوە. بەو پێیەی میدیای عەرەبی خێرا ڕەخنە دەگرن ئەگەر ئیلتیزامیان لاواز بێت، ڕێبوار جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کە ئەوانەی دەڵێن با سەربازانی کورد نەچن بۆ بەغدا لە واقیع دابڕاون.

لەگەڵ ئەوەشدا توبا کە کوڕەکەی ئەوەندە نابێت وەك بەشێك لە سوپا بەرەو بەغدا بەڕێکەوتووە، پێیوایە لەوانەیە کوڕەکەی سەرەنجام ببێتە قوربانی، کە بەبڕوای ئەو قوربانیدانێکی ناپێویستە. وتیشی « خەم لەوە دەخۆم ئەگەر کوڕەکەم تیا بچێت لە پێناو شوێنێکدایە کە هیچ کوردێك دڵی پێی خۆش نییە ».

### ۲- ستۆری دیاردەگەرایی phenomenon story

ئەو شتانەی کە ڕوخساری دیاردە وەردەگرن، واتە دووبارەبوونەوەی ڕووداوێك زیاد لە ئاستی ئاسایی خۆی دەتوانرێت بەم شێوە پۆلێنبەندییەی ستۆری رومالبکرێت. هەندێ جار دیاردەکە ئاشکرایەو بە ئاسانی دەناسرێتەوەو هەستی پێدەکرێت بەڵام گرنگترین کاری ئەم شێوەیەی ستۆری ئاشکراکردنی دیاردەکەیە یاخود خستنەڕووی ڕووداوێکە وەکو دۆخێکی دیاردەگەرایی، هەڵبەت ئەویش پێویستی بە بەڵگە و نمونەی واقیعیو دروست هەیە، هەروەك ئامارو داتاش شتانێکی گرنگن بۆ خەملاندنی قەبارەو ئاستی زیادبوونی ڕووداوەکە و دواتر خستنەڕووی لە شێوەی دیاردەیەکدا، بۆ نمونە بۆئەوەی بیسەلمێنین حاڵەتی لێکجیابوونەوە لە نێو خێزانی کورددا دروستبووە دەبێت ئاماری فەرمی چەند ساڵێکی ئەو حاڵەتە وەربگرین و بەراوردی بکەین کە ئایا زیادی کردووە یان کەم، بە هەمان شێوە ئەگەر ئامارەکان ئاماژەیان بە زیادکردنی حاڵەتەکە کرد ئەوسا پێویستمان بە چەند چیرۆك و ڕووداوێکی واقیعییە کە بەرجەستەی ئەو دیاردەیەیان کردبێت. کەواتە ڕۆژنامەنووس لە ڕێگەی ستۆری دیاردەگەراییەوە شوناسی قەیران و ڕووداوەکان دیاریدەکات و



ماسکی سەر ئەو شتانەش ئاشکرا دەکات کە ڕوخساری دیاردەیان وەرگرتووە ئەویش لە پێناو هۆشیارکردنەوەی هاوڵاتیانو دەسەڵات لە کاریگەریو کاردانەوەکانی ئەو دیاردەیە، بەوپێیەی هەر ڕوداوێك کە دەبێتە دیاردە کاریگەری و کاردانەوەی زیاتر و قورستری هەیە لەسەر هاوڵاتیان و کۆمەڵگە. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ستۆری دیاردەگەرایی phenomenon ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوە :

### گوندنشینەکان و کرێکاران ئیشە کەمدەرامەتەکانی خۆیان جێدەهێڵن و دەبنە پۆلیس

**فرمان عەبدولرحمان لە سلێمانی**

بەیانی زوو، ئەحمەد ساڵحی تەمەن **۳۷** ساڵ، کە کارمەندێکی حکومەتە، دەچێتە سەرەیەکی درێژەوە بۆ نان لەو تاکە نانەواخانەیەی کە لە گەڕەکەکەیاندا ماوە. پێش ڕووخانی ڕژێمەکەی سەدام چەند نانەوایەك لە گەڕەکەکەیاندا ئیشیاندەکرد، بەڵام ئێستا زۆربەیان وازیان لەو ئیشە هێناوە و پەیوەندیانکردووە بە هێزی پۆلیسەوە.

لە نیسانی **۲۰۰۳** ەوە، هێزی پۆلیس لە پارێزگای سلێمانی زیاتر لە سێ ئەوەندە زیادیکردوە و لە **۷** هەزار پۆلیسەوە بووە بە نزیکەی بیست هەزار پۆلیس تا کۆتایی **۲۰۰۵**.

لیوا جەمال ئەحمەد بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسی هەرێمی کوردستان لە سلێمانی وتی: «ئێمە ئەمانەوێت ئاسایشی ناوچەکە بەشێوەیەکی باش بپارێزین و ژینگەیەکی ئارام بۆ خەڵکەکەی دابینبکەین.»، هەروەها وتیشی «هێزەکانی پۆلیس هەیبەتی حکومەت و ئاسایشی ناوچەکەیان ڕاگرتووە، لەبەرئەوە تاهێزەکانمان زیاتر بێت کاریگەریمان زۆرتر دەبێت.»

کە حکومەت مووچەی پۆلیسی زیادکرد و ئەو هێزەی فراوانکرد لە سەلامەتترین پارێزگای عێراقدا، خەڵکی کەوتنە جێهێشتنی ئیشە کۆنەکانیان لە بواری کشتوکاڵ و ئەو کەرتانەی تر کە ئیش تێیاندا قورسە بۆ ئەوەی وەکو پۆلیس کاربکەن.

تازە دامەزراوەکان مانگی ١٧٠ دۆلار وەردەگرن، کە زۆر زیاترە لەو ٣٠ دۆلار مانگانەیەی پێش ٢٠٠٣ وەریاندەگرت. ساڵی پار مووچەی سەرەتا ٢٢٠ دۆلار بوو، بەڵام حکوومەتی سلێمانی بڕیاریدا کەمیبکاتەوە لەبەر ئەوەی ئیشەکە مەترسی کەمترە لە بەشەکانی تری عێراق. بەڵام ئەو مووچەیە لەچاو مووچەی کارمەندەکانی تری حکوومەتدا باشە کە هەندێکیان مووچەیان لە ١٠٠ دۆلار کەمترە، ئەوە سەرەڕای ئەوەی هەندێك لە پۆلیسەکان مانگێ تەنها پانزە ڕۆژ دەوامدەکەن.

ئەم شەپۆلی دامەزراندنە ئیشی بۆ هەزاران کەس دابینکردووە کە ئەگەر وانەبوایە فرسەتێکی کەمیان دەبوو، بەتایبەت بوون بە پۆلیس تەنها پێویستی بە بڕوانامەی سەرەتایی هەیە.

سلێمانی پارێزراو بووە لە بەشێکی زۆری ئەو توندوتیژییەی لە بەشەکانی تری عێراقدا دەبینرێت، هەروەك بوون بە پۆلیس لێرە تاڕادەیەکی زۆر مەترسی کەمترە لە ناوچەکانی تر کە تێیدا هێزەکانی ئاسایش ئامانجی یەکەمی چەکدارە یاخیبووەکانن، بەڵام لێشاوی دامەزران لە سلکی پۆلیسدا لە هێزی کاری کەرتەکانی تری کەمکردوەتەوە. لەو نێوەندەدا زەرەری گەورە بەر کەرتی کشتوکاڵ کەوتووە، لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە جووتیاران وازیان لە ئیشەکەی خۆیان هێناوە و بوونەتە پۆلیس و گوندنشینەکان خێزانەکانیان دەهێنن بۆ شارەکان بۆ ئەوەی پەیوەندی بە هێزی پۆلیسەوە بکەن، بەوەش بازاڕی موڵك و عەقاراتی سلێمانی کەوتووەتە ژێر فشارێکی زیاترەوە کە خۆی بەدەست کێشەیەکی توندی نیشتەجێبوونەوە دەناڵێنێت.

ئیبراهیم خدر بەڕێوەبەری گشتی پلاندانان و بەدواداچوون لە وەزارەتی کشتوکاڵ وتی «کشتوکاڵ لەمڕۆدا ناتوانێت بژێوی گوندنشینەکان دابینبکات بۆیە ناچارن بە شوێن بەدیلی تردا بگەڕێن.»

لەو چوارچێوەیەدا دڵشاد عەلی، ٢٧ ساڵ، خەڵکی شارباژێڕە لە باکووری سلێمانی، ساڵێك لەمەوبەر دەستی لە ئیشکردن هەڵگرت لە باخێکی ترێی



خێزانەکەیاندا و بووە بە پۆلیس لە سلێمانی. دڵشاد وتی «ئێستا مووچەیەکی باشم هەیە و ئیشەکەشم هێندەی ئیشەکەی پێشوم قورس نییە.»

دڵشاد ئەوەشی خستەڕوو کە گوندەکەیان لە کۆی ٣٥ ماڵ تەنها ٨ ماڵی لێماوە.

حەمەلاو ناسیح کە وەستایەکی تەختەبەستنە و تەمەنی ٣٥ ساڵە، شەش کرێکاری بینا ئیشیان لەگەڵ دەکرد، بەڵام چواریان وازیان هێنا و بوون بە پۆلیس.

حەمەلاو وتی «ئەوان بە هیلاکبوونێکی زۆر کرێیەکی کەمیان وەردەگرت» و ئەوەشی ووت کە کرێکارەکانی پێشووی ئێستا بوونەتە خاوەنی سەیارەی خۆیان.

حەمەلاو بۆ کارەکەی ئێستا پشت بەو کرێکارە عەرەبانە دەبەستێت کە لە ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە ڕوویانکردۆتە ناوچە کوردنشینەکان بۆ کارکردن بە هۆی خراپی باری ئەمنی ناوچەکانی خۆیان.

د. محەممەد ڕەئوف پسپۆڕی ئابووری لە زانکۆی سلێمانی هاوڕایە لەوەدا کە حکوومەت بێکاری کەمکردووەتەوە لە ڕێگەی دامەزراندنی خەڵکەوە بە پۆلیس و تێبینی ئەوەشیدا کە بازاڕی کاری کوردستان لەگۆڕاندایە لەکشتوکاڵەوە بۆ بوارەکانی خزمەتگوزاری. بەڵام هۆشداریشیدا کە «پێویستە حکوومەت بەشێوەیەکی هاوسەنگ گرنگی بە هەموو کەرتە ئابوورییەکان بدات».

دڵشاد یوسف کە پۆلیسێکی تەمەن ٢٤ ساڵە دەڵێت پۆلیسی ئاستێکی باشی گوزەران دابیندەکات، بەڵام پێیوایە مووچەکە هێشتا کەمە بە هۆی ئەو مەترسیانەی ئەو ئیشە لەخۆیدەگرێت. دڵشاد وتی «ڕاستە مەترسی نییە، بەڵام شتێك ڕوودەدات ئێمە یەکەم قوربانین».

### ٣- ستۆری ئابووری economic story

لێرەدا مەبەستمان ڕۆژنامەگەری ئابووری نییە چونکە ئەوە بوارێکی جیاوازە و تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەروەك ئەو بابەت و ژانرە ڕۆژنامەنووسیانەشی لەو بوارەدا پەیڕەو دەکرێ هەڵگری ڕوخسارو سیمای تایبەتی خۆیانن، بەڵکو ستۆری ئابووری

تەنها لەوەدا هاوبەشە کە ناوەڕۆکی ڕووداوەکە ڕەهەندێکی ئابووری هەیە و تیایدا مەبەستیەتی کاریگەرییە مرۆییەکانی ئەو بابەت یان ڕووداوە ئابوورییە بخاتەڕوو. شێوەی ستۆری ئابووری وەکو هەموو شێوەکانی تری ستۆری هەمان میتۆدو ڕەگەزە سەرەکییەکانی ستۆری تێدا بەکاردەهێنرێت. هەرچەندە لە ستۆری ئابووریدا بە هەمان شێوەی کارە جیاوازەکانی ڕۆژنامەگەری ئابووری گرنگی بە ژمارەو ئامارو داتا دەدات، بەڵام ئەوەی ستۆری ئابووری لەوانی دی جیادەکاتەوە پەیوەستکردنی بابەت و ڕووداوە ئابوورییەکانە بە ڕەهەندە مرۆییەکانەوە، واتە ستۆری ئابووری ئیش لەسەر بابەتە ئابوورییەکان دەکات لە ڕوانگەیەکی مرۆییەوە. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ستۆری ئابووری economic story ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوە :

**کوردەکان هەوڵ دەدەن کارەبا بۆ خۆیان بەرهەم بهێنن سەرباری ئەوەی زۆربەی پرۆژەکانی کارەبا تەواو نەبوون، بەڵام پێدەچێت کەمێکیان کاریگەرییان هەبێت**

**فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی**

دەسەڵاتدارانی کوردستانی عێراق لە ڕێگەی ئەنجامدانی گرێبەستی تایبەت هەوڵدەدەن چارەسەرێك بۆ کێشەی کەمی کارەبا بکەن، بەڵام پێدەچێت کەمێکییان سوودییان هەبێت و ئەو ئامانجە بەرجەستە بکەن.

لە باکووری عێراق پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە لە بەرزبوونەوەدایە و چەندین بیرە نەوتی نوێ لێدراوە، ئەوە لە کاتێکدایە دەیان هەزار خێزانی عێراقی لە ناوچەکانی ترەوە ڕوویان لە کوردستان کردووە لە ترسی ئەو توندوتیژیەی ناوەڕاست و باشووری عێراقی گرتووەتەوە، هەمووشیان سەرقاڵی گەڕانن بە شوێن کار و بژێویدا.

بەڵام ژێرخانی کوردستان ناتوانێت پێداویستییەکانی ٤ ملیۆن دانیشتوانی هەرێم و ئەو هەزاران خێزانە ئاوارەیەش دابینبکات کە فشارێکی زۆری بۆ هەرێم دروستکردووە.



کەمی کارەبا لەو مەسەلە گرنگانەیە کە جەماوەر بەهۆیەوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی هەولێرو سلێمانیدا ناتەبان، هەرچەندە دهۆك لە تورکیاوە کارەبا وەردەگرێ و لەو لایەنەوە کێشەی نییە.

کوردستانی عێراق پێش ١٦ ساڵ لەمەوبەر کە لە دەسەڵاتی سەدام حسێن جیابوەوە و شێوەیەکی نیمچە سەربەخۆی وەرگرت، کارەبای هەرێم لەگەڵ وێستگە سەرەکییەکانی وڵات پچڕا، لەو کاتەوە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕو نارێکخراو هەوڵدراوە بۆ چاککردنی کێشەی کارەبا. بەڵام پاش تێپەڕینی دوو دەیە بەسەر خۆ ئیدارەکردنی ناوچە کوردییەکاندا، حکوومەتی هەرێم نەیتوانیوە ئەو کێشەیە چارەسەر بکاتو هیچ کارێکی گرنگی نەکردووە بۆ چارەسەرکردنی قەیرانەکە، هەربۆیە دەسەڵاتداران تەنها بەڵێنی چارەسەری قەیرانەکەیان بە خەڵکی داوە، کە ئەوەش هاوڵاتیانی بێ ئومێد کردووە و ئاماژە بەوە دەکەن کاتێك باوەڕ بەو بەڵێنانە دەکەن کە لەسەر ئەرزی واقیع بەرجەستە ببێت.

سیروان محەمەد، سەرنووسەری گۆڤاری پیشەسازی، کە گرنگی بە بواری پیشەسازی دەدات لە هەرێمی کوردستاندا، وتی : «حکوومەتی هەرێم هەوڵی چارەسەرکردنی قەیرانی کارەبا نادات بەڵکو ئیدارەی قەیرانەکە دەکات».

بەرپرسانی وەزارەتی کارەبای هەرێم ئاماژە بەوە دەکەن کە دەتوانن نیوەی پێداویستییەکانی خەڵکی بۆ کارەبا بەرهەم بهێنن، هەرچەندە دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام حسێن کارەبای هەرێم بەسترایەوە بە تۆڕی نیشتمانی هەموو عێراقەوە کە ئەویش خۆی لە خۆیدا تۆڕێکی لاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتداران پێیانوایە مەترسییەکانیان بۆ چارەسەری کێشەکە لە گەڕانە بە شوێن سەرچاوەی تری وزەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا حکوومەتی هەرێم لەم ساڵانەی دواییدا چەند گرێبەستێکی بۆ دامەزراندنی چەند وێستگەیەکی بەرهەمهێنانی کارەبا ئیمزا کرد، بەڵام تەنها کەمێکیان کاریگەرییان هەبووە. هەر لەو چوارچێوەیەدا حکوومەتی هەرێم ساڵی ٢٠٠٦ گرێبەستێکی بە بڕی یەك ملیۆن دۆلار لەگەڵ ئێران ئیمزا کرد بۆ هێنانی

کارەبا لەو وڵاتەوە، بەڵام گرێبەستەکە شکستی هێنا، کاتێك ئێران داوای ئـەوەی لـە حکوومەتی هەرێم کرد کە گرێبەستەکە بۆ ماوەی â& ساڵ بەردەوام بێت.

حکوومەتی هەرێم، کە خاوەنی پەیوەندییـەکی باشـە لەگـەڵ ئێرانـدا توشـی بـێ ئومێدی بـوو بـەهۆی ئـەو داوایـەی ئێرانـەوە. شـەونم محەمـەد بەڕێوەبـەری گـشتی فەرمانگـەی کارەبـای سـلێمانی وتـی:«بەراسـتی ئـەو ماوەیـەی پێـشنیارکراوە بـۆ گرێبەستەکە زۆر درێژە».

شەونم محەمەد ئاماژەی بەوەشکرد کە سەختی دۆزینەوەی سەرچاوەیەك کە پـشتی پێبەسـترێت بـۆ بەرهـەم هێنـانی کارەبـا بەشـێکە لـە کێـشەکان، لەوبارەیـەوە وتی:«مەسەلەکە زۆر ئاڵۆزە، تەنانەت ئەگـەر بـڕی بەرهـەمی وزەی کارەبـاش زیـاد بکەین کێشەکە چارەسەر نابێـت، چـونکە تـۆڕی دابەشـکردن و گواسـتنەوەی ووزەی کارەبا زۆر کۆنە و پێویستی بە نۆژەنکردنەوەی تەواوەتی هەیە».

لگەڵ ئەوەشدا حکوومەتی هەرێم سوورە لەسەر گرتنەبەری هەنگاوی بوێرانـە بـۆ چاك کردنی سیستمی کارەباو بوونیادنانی ژێرخانێکی گونجاو، هەروەك لێپرسـراوانیش باس لەوە دەکەن کە ئەو پرۆژانەی ئێستا لە ژێر جێبـەجێ کردنـدان دەتـوانن ٨٠٪ی پێداویستییەکانی کارەبای کوردستانی عێراق دابینبکەن.

ئیدارەی سلێمانی بڕی ٢٣٤ ملیۆن دۆلاری تەرخانکردووە بۆ پرۆژەکـانی بەرهـەم هێنانی کارەبا، هەروەها لە هەولێریش ٣٠٠ ملیۆن دۆلار تەرخانکراوە بۆ راکێـشانی گازی سروشتی بە مەبەستی ئیشپێکردنی وێستگەیەکی بەرهەم هێنـانی کارەبـا کـە بڕیارە لە هەولێر دروستبکرێت و توانای بەرهـەم هێنـانی ٥٠٠ مێگـاوات کارەبـای هەیە.

جگە لەوانەش بانکی نێودەوڵەتی بڕی ٤٠ ملیـۆن دۆلار قـەرزی بـە حکوومـەتی هەرێم داوە بـۆ نۆژەنکردنـەوەی هـەردوو پـرۆژەی هایـدرۆپاوەری بەنـداوی دوکـان و دەربەندیخان لە پارێزگای سلێمانی، کە بەشێکە لەو قەرزە ٤٠٠ ملیۆنییەی دراوە بـە حکوومەتی عێراق بە مەبەستی چاککردنی تۆڕی کارەبای گشتی لە عێراقدا.



بەڵام پێناچێت هەمموو ئەو پرۆژانە بە شـێوەیەکی ئاسـان جێبـەجێ بکـرێن، ئـەو وێستگەیەی کە ساڵی ٢٠٠٦ لە هەولێر دەستی پێکراو بڕیاربوو لە تەموزی ٢٠٠٧دا تەواو بێت، بەڵام بەهۆی چەند ئاستەنگێکەوە تەواوبوونی پرۆژەکە دواکەوت بۆ سـاڵی ٢٠٠٨.

هۆشیار سیوەیلی، وەزیری کارەبای حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان رایگەیانـد هەرچـەندە هـەولێر یەکێکـە لـە ئـارامترین شـارەکانی عێـراق، بـەڵام ئەنـدازیارە بیانییەکانی پرۆژەکە شاری هەولێریان جێهێشت دوای تەقینەوە خۆکوژیەکەی مـانگی ئاياری ٢٠٠٧ کە شارەکەی هەژاند، ئەوەش کۆمەڵێك گرفتی تەکنیکی بۆ تەاوبوونی پرۆژەکە لە کاتی خۆیدا دروستکرد.

لەگەڵ چاوەڕوانی چارەسەرکردنی قەیرانی کارەبادا لـە هەرێمەکـە، ئـەو کێـشەیە وردە وردە کاریگەری و رەنگدانەوەی خراپ بەجێدەهێڵێت بە سەر بوارە جیاوازەکـانی ژیانی هەرێمەکە. بـە پێـی ئامـارێکی یـەکێتی پیـشەسازییەکانی کوردسـتان، کـە رێکخراوێکی ناحکومییە و چـاودێری ئیـشوکارە پیـشەسازییەکانی هـەرێم دەکـات، نزیکەی ٣٠٠ پـرۆژە و کارگـەی بـچوك لـە لێـواری داخـستندان بـەهۆی نـەتوانینی دابینکردنی کارەبای پێویستەوە، چونکە بەکارهێنانی موەلیدە وەکو خاوەن پرۆژەکـان باسی دەکەن هەم زیان بـە کـوالیتی بەرهەمـەکانییان دەگەیـەنێت، هـەمیش نرخـی تێـچونی بەرهەمـەکان بەرزدەکاتـەوە کـە ئـەوانیش ناچـاردەبن بـە گـران بیخەنـە بازارەکانەوە، ئەوەش لە ڕووی نرخـەوە ئەگـەری کێبـەرکێ کردنـی لەگـەڵ بەرهەمـە بیانییەکاندا لاواز دەکات.

دەستەوستانی حکوومەت و زۆریـی پێداویـستییەکان هاوڵاتییـانی ناچـارکردووە خۆیان بیر لە بەدیلێکی تر بکەنەوە بۆ فەراهەمکردنی وزەی پێویستی کارەبا، ئەوەش لە رێگەی موەلیدەی بچوکەوە کە لە بازارەکاندا دەفرۆشرێن. بە پێی هەمان ئامـاری یەکێتی پیشەسازییەکانی کوردستان لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٥ بۆ ٢٠٠٦ رۆژانـە ١٠٠ موەلیدە تەنها لە بازاڕەکانی شاری سلێمانیدا فرۆشراون، بەڵام ئەم چارەسەرە کاتییەی

هاوڵاتییان بۆ خۆیان دەستەبەرییان کردووە خاڵی نییە لە مەترسی و تەنانەت مەرگیش.

به پێی ئامارێکی نەخۆشخانەی ئێمێرجنسی سلێمانی نزیکەی ٢٠٠٠ کەس لە سلێمانی لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٥ بۆ ٢٠٠٦ رووبەڕووی سوتان بوونەتەوە بەهۆی مولیدەوە، لەو ژمارەیە ٥٢٠ کەسیان گیانییان لە دەستداوە. زۆربەی حاڵەتەکانی سوتان لە کاتی تێکردنی بەنزین بۆ ناو مولیدەکان روودەدەن، بێ ئەوەی بیکوژێننەوە، هەروەکو ئەو حاڵەتەی بەسەر بڕیار سلێمان، ١٨ ساڵ، روویدا، کە لە شوباتی ٢٠٠٦دا رووبەڕووی سوتان بووەوە کاتێك بەنزینی کردبووە ناو مولیدەکەوە لە کاتی ئیشکردنیداو بەوهۆیەوە گیانی لە دەستدا.

فەوزیە خالید دایکی بڕیار، کە مەرگی کوڕەکەی توشی بێ ئومێدییەکی قوڵی کردبوو، وتی: «ئەگەر حکوومەت چارەسەری کێشەی کارەبای بکردایە پەنامان بۆ مولیدە نەدەبردو کوڕەکەشم بەو هۆیەوە گیانی لە دەست نەئەدا».

### ٤- ستۆری قەیران crisis story

ئەم شێوەیەی ستۆری بە دواداچوون و لێکدانەوە بۆ ئەو قەیرانە جیاوازانە دەکات کە خاوەنی کاردانەوەی پنتفراوانە و هەندێ جار ئاراستەی هاوکێشە سیاسییەکان دەگۆڕێت، هەروەك پێشبینیو پێشهاتی رووداوەکان نیشاندەدات لە رێگەی کۆکردنەوەی بیروڕا جیاوازەکانی لایەنە پەیوەندیدارەکان بە قەیرانەکەوە، مەرج نییە هەمیشە قەیرانی سیاسی ئامانجی ئەم شێوەیەی ستۆری بێت، بەڵکو زۆرجار قەیرانی کۆمەڵایەتی و تەندروستی و ئابووری بابەتگەلێکی گرنگی رووماڵکردنن، وەکو قەیرانی ئەنفلۆنزای باڵندە، قەیرانی سووتەمەنی، قەیرانی هەڵاوسان. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ستۆری قەیران crisis ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوە :



**کوردستانی عێراق خۆی بۆ پەلاماری تورکیا ئامادەدەکات**

**فرمان عەبدولڕەحمان لە قەندیل**

جەنگاوەرانی کورد لە قووڵایی شاخەکانی کوردستانی عێراق دەڵێن ئامادەن دژی تورکیا بجەنگن ئەگەر پەلاماری هەرێمی کوردستان بدات بۆ دەرکردنی گەریلاکانی پەکەکە.

لیوا جەبار یاوەر، وتەبێژی فەرمانـدەیی گشتی هێزی پاسەوانی هەرێمی کوردستان رایگەیاند هێزەکانی کوردستان بەرگری دەکەن لە دژی تورکیا ئەگەر بێتە ناو عێراقەوە، لیوا جەبار یاوەر وتی «هێزێکی باشمان لە کوردستان هەیە و توانیومانە ئەمنییەتی کوردستان چەند ساڵ بپارێزین، ئێمە رێگا بۆ سوپای تورکیا چۆڵناکەین و بەرگری دەکەین».

لیوا جەبار یاوەر ئاماژەی بەوەشکرد کە تورکیا شەڕی خۆی لەگەڵ پەکەکە وەکو بیانوویەك بەکاردەهێنێت بۆ لەشکرکێشییەکی سەربازی بۆ هەرێمی باکووری عێراق کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیە.

یاوەر ئەوەشی وت «تا ئێستا تورکیا ئەم هەرێمەیان پێ قبووڵ ناکرێت.»

پەکەکە ئێستا رووبەڕووی گەورەترین تەحەدا دەبێتەوە لەلایەن تورکیاوە لەو کاتەوەی بارەگایان لە ناوچەی قەندیل دامەزراندووە لە ١٩٨٢دا.

تورکیاش پاش چەند هەفتەیەك لە شەڕی قورس لەسەر سنووری عێراق لە نێوان پەکەکە و هێزەکانی تورکیادا کە تیایدا دەیان کەس لە هەردوولا کوژران، هەڕەشەی ئەوە دەکات پەلاماری کوردستان بدات.

ئەنقەرە ئەمریکا و حکوومەتی عێراقی بەوە تاوانباردەکات کە وەکو پێویست کاریان نەکردووە بۆ رێگرتن لە پەکەکە بۆ سنووردارکردنی پەلامارەکانی لەسەر سنوورەوە.

واشنتۆن، کە هاوپەیمانێکی تورکیایە، سەرقاڵی ئەنجامدانی هەوڵی دیبلۆماسییە بۆ رێگرتن لە تورکیا لە پەلاماردانی باکووری عێراق، کۆندەلیزا رایسی وەزیری

دەرەوەی ئەمریکا لە رۆژی ١١/٢دا لە ئاستێکی بەرزدا وتوێژی لەگەڵ سەرکردەکانی تورکیادا ئەنجامدا.

رەجەب تەییب ئۆردوگانی سەرەك وەزیرانی تورکیا بڕیارە لەگەڵ جۆرج بوشی سەرۆکی ئەمریکا لە رۆژی ١١/٥دا کۆببێتەوە و لێپرسراوانی تورکیاش دەڵێن کە ئەو وڵاتە بڕیاردەدات ئایا دوای کۆبوونەوەکە پەلاماری باکووری عێراق دەدات یان نا.

لە کاتێکدا ئەمریکا و تورکیا پەکەکە بە رێکخراوێکی تیرۆریستی لەقەڵەمدەدەن، بەڵام ئەو حیزبە و لایەنگرانی دەڵێن کە بۆ مافەکانی کورد خەباتدەکەن.

هەرچەندە ئەمریکا و لێپرسراوانی عێراقی لە کۆبوونەوەکانی ئەم دواییانەدا لەگەڵ لێپرسراوانی تورکیادا بەڵێنیانداوە پەلاماری ئەو حیزبە بدەن، بەڵام سەرکردە کوردەکانی عێراق و چەکدارانی پەکەکە دەڵێن دەستڕاگەیشتن بە بارەگاکانی ئەو حیزبە لە بەرزاییە سەختەکانی قەندیل شتێکی مەحاڵە.

زنجیرە چیای قەندیل نزیکەی ٣٥٠٠ مەتر بەرزە و رووبەرەکەی ١٥٠٠ کم دووجا دەبێت و دەکەوێتە نێوان عێراق و ئێران و تورکیاوە. ئەو ناوچەیە لە کوردستانی عێراق بە «تۆرابۆرای عێراق» ناسراوە، ئەمەش ئاماژەیە بەو ناوچە شاخاوییە سەختەی ئەفغانستان کەوا پێدەچێت چەکدارەکانی قاعیدە و تالیبان خۆیان تێدا حەشاردابێت.

پەکەکە کۆنترۆڵی ئەو شارۆچکانەی کردووە کە دەکەونە دامێنی شاخەکانەوە و پێویستیشە بەپێ هەڵگەڕێی بەو شاخە سەختانەدا بۆ ئەوەی بگەیتە بارەگاکانی ئەو حیزبە. گەریلاکان بەدرێژایی زنجیرە شاخەکە مەتەرێز و تونێلیان لێداوە کە بە زستانان بەفر تەواو دایاندەپۆشێت.

عەبدولڕەحمان چادرچی، ئەندامی کۆنسەی سەرۆکایەتی پەکەکە رایگەیاند بەهۆی بارودۆخی سەختەوە، باوەڕناکات تورکیا هێرشێکی زەمینی بەرفراوان بکات بۆ سەر بارەگاکانی پەکەکە، سەرباری ئەو هەواڵانەی کە دەڵێن تورکیا ١٠٠ هەزار سەربازی



رەوانەی سەر سنوور کردووە. عەبدولڕەحمان وتیشی «ئەگەر تورکیا پەلاماری قەندیل بدات، ئەوا هێرشی ئاسمانی دەکات.»

فوئاد حسێن، سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان، بە ئینستیتۆی رۆژنامەوانی جەنگ و ئاشتی (IWPR)ی راگەیاند کە هێزی سەربازی پێشمەرگەی کوردستان ناتوانێت پەکەکە لەو ناوچە دووردەستە سەختانە دەربکات، هەروەها وتیشی «تورکیا داوای شتێك لە هەرێمی کوردستان دەکات کە لە توانای ئێمەدا نییە»، هەروەك داواشی لە پەکەکە کرد واز لە پەلاماردانی سوپای تورکیا بهێنن و بیانو نەدەن بەدەست سوپای تورکیاوە بۆ ئەوەی بێنە ناو هەرێمی کوردستانەوە.

فوئاد وتیشی «وەدەرنانی پەکەکە ئەو زنجیرە شاخانە دەخاتە بەردەستی ئیسلامییە توندڕەوەکانەوە و ئەوان جێیاندەگرنەوە، وەکو ئەنسار ئیسلامی سەر بە قاعیدە».

لە لایەن خۆشیەوە نەورۆز جەرەند، ئەندامی کۆنسەی سەرۆکایەتی پەکەکە، پشتڕاستیکردەوە کە حیزبەکەی چەند جار لەگەڵ ئەنسار ئیسلامدا بەشەڕهاتووە لەو ناوچە شاخاویانەدا.

هەروەها راشیگەیاند کە پەکەکە ٨ سەربازی تورکی وەکو دیلی جەنگ لایە، کە لە شەڕێکی کۆتایی مانگی ئۆکتۆبەردا بەدیلگیراون و ئێستا لای پەکەکەن لەناو خاکی تورکیادا، هەروەك داوەتی لیژنەی نێودەوڵەتی خاچی سووری کرد سەردانیان بکەن.

لە کاتێکدا کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەستگیرکردنی سەربازەکانی تورکیای ئیدانەکردو داوای لە پەکەکە کرد واز لە پەلاماردانی تورکیا بهێنێت، بەڵام کوردەکانی عێراق مەیلی پشتیوانیکردن لەو حیزبە دەکەن و بەڵگەشیان ئەوەیە کە تورکیا جیاوازیدەکات لە دژی دانیشتوانی کوردی ئەو وڵاتە. خەڵکێکی زۆریش گومانی ئەوە دەکەن کە تورکیا دەیەوێت سنوورێك بۆ دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دابنێت.

گەریلاکانی پەکەکەش سەرباری سەختی ناوچەکەیان خۆیان ئامادە کردووە بۆ جەنگێکی خوێناوی، ساریا مستەفا، ٢٠ ساڵ، کە کچە چەکدارێکی کوردی سوریایە لەگەڵ پەکەکە و ساڵی پار پەیوەندی کردووە بە ریزەکانی ئەو حیزبەوە، وتی «ئامادەم بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی تورکیا. ساریا لەگەڵ خواردنەوەی پیاڵەیەك چادا دوای مەشقێکی سەربازی، ئەوەشی وت «مەگەر سوپای تورکیا بەسەر لاشەی مندا بێتە قەندیل».

### ٥- ستۆری لە پشت ستۆری the story behind story

ئەم شێوەیەی ستۆری بۆ بە دواداچوونی ئەو ستۆرییە گرنگانەیە کە سەدایەکی رۆژنامەوانی هەیەو وەکو تەواوکارییەك بۆ کارەکەی رابردووی، رۆژنامەنووس ئەوە بۆ خوێنەرەکەی روووندەکاتەوە کە چۆن و بە چ شێوەیەك قۆناغە جیاوازەکانی ستۆرییەکەی پێشووتری تەواو کردووە، ئەکرێت بڵێین ئەم شێوەیەی ستۆری تەواو لەوانی دی جیاوازە، چونکە جگە لەوەی کە بە کەسی یەکەمی تاك دەنووسرێت، لە هەمان کاتیشدا لەم شێوەیەدا رەگەزە سەرەکیەکانی ستۆری تێدا بەرجەستە ناکرێت، هەروەك خۆشی ناتوانرێت وەك ژانرێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو هەمیشە تەواوکەری ستۆرییەکی ترە کە پێشتر رۆژنامەنووسەکە نووسیویەتی و دەنگدانەوەی گرنگی هەبووە لە ناوەندی سیاسی و رۆژنامەگەریدا. بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە شێوی ستۆری لە پشت ستۆری ئەم ستۆرییە بخوێنەرەوە کە لەسەر راپۆرتێکی پێشتر لەسەر بارودۆخی قەندیل نووسراوە:

**کوردستانی عێراق خۆی بۆ هێرشی تورکیا ئامادە دەکات**

**دەربارەی راپۆرتەکەم لە قەندیل، کە لە ٢٠٠٧/١١/٢دا بڵاوکراوەتەوە**

**فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی**

ماوەی چەند مانگێکە لە نزیکەوە بەدواداچوون دەکەم بۆ هەواڵەکانی تایبەت بە ئەگەری پەلامارێکی سەربازی تورکیا بۆ کوردستانی عێراق.



وەکو رۆژنامەونووسێك، مۆڵەت وەرگرتن بۆ سازدانی دیدار لەگەڵ لێپرسراوانی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) پرۆسەیەکی هەروا ئاسان نییە. پێویستە زنجیرەیەك لە ئەندامانی پەکەکە چاو بەداواکەتدا بخشێننەوەو ئەگەر چانست هەبوو، مۆڵەتی چاوپێکەوتنێکت پێدەبەخشرێت. ئینجا دوای ئەوە، سەفەرێکی درێژ دەستپێدەکات.

کەمێك دوای ئەوەی پەکەکە داواکارییەکەمیان بۆ سازدانی چاوپێکەوتن پەسەندکرد، لەگەڵ دوو هاوەڵدا روومکردە شاخی سەختی قەندیل کە بارەگای گەریلاکانی پەکەکەی لێیە. ناوچەکە نزیکەی ١٠٠ کم لە باکووری خۆرهەڵاتی سلێمانییەوەیە لە کوردستانی عێراق.

پەکەکە لە ساڵی ١٩٨٤ ەوە لەگەڵ حکوومەتی تورکیادا لە جەنگدایە بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکانی تورکیا. بەڵام تورکیا هەمیشە نیگەرانی ئەو راستییە بووە کە پەکەکە لە کوردستانی عێراقدان و حکوومەتی تورکیاش حکوومەتی عێراقی بەوە تاوانبارکردووە کە بەپێی پێویست کارناکات بۆ ئەوەی نەهێڵێت پەکەکە سنووری تورکیا ببەزێنێت و پەلاماری سەربازانی تورکیا بدات.

لەمدواییانەدا شەڕ و پێکدادان لە نێوان تورکیا و پەکەکەدا هەڵگیرسا و تورکیا بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك هەڕەشەی ئەوەی کرد کە کوردستانی عێراق داگیردەکات بۆ ریشەکێشکردنی پەکەکە. منیش چووم بۆ شاخی قەندیل بۆ رووماڵکردنی مەسەلەکە لە گۆشەنیگای پەکەکەوە. وەکو پەیامنێرێك زۆر گرنگە بۆ من بارودۆخەکە بە چاوی خۆم ببینم.

شەڕەکە بەشێوەیەکی سەرەکی لە نێوان سەربازانی تورکیا و جەنگاوەرانی پەکەکەدا بوو لە نزیك دهۆك، لەسەر سنووری عێراق - تورکیا لەو پەڕی باکووری عێراق، لەبەرئەوە نەچوومە ناوچەی شەڕەکەوە. بەڵام بێگومان پەکەکە لە شاخی قەندیل دەکرێنە ئامانج ئەگەر تورکیا بڕیاری دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی سەربازی بدات. ئێستاش هەر چاوەڕوانین بزانین تورکیا پەلامارەکەی دەستپێدەکات یان نا.

ئەمە دووەم سەفەرم بوو بۆ ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی پەکەکە لە قەندیل، ئەمجارەیان باشتر خۆم ئامادەکردبوو، جلوبەرگ و پێڵاوی قایم بۆ ئەو ژینگە شاخاوییە سەختە ئامادەکردبوو.

بە دوایەمین خاڵی پشکنینی حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا تێپەڕین کە لەوێدا ناوەکانمان تۆمارکرا، پاش لێخوڕین بۆ ماوەی نزیکەی ٣٠کم بە ڕێگەی پێچاوپێچی شاخاویدا گەیشتینە یەکەم خاڵی پشکنینی پەکەکە، ئەگەر ئەندامێکی پەکەکە بە سەیارە هەڵتنەگرێت لە خاڵی پشکنینی پەکەکەدا، ئەوا دەبێت لانیکەم کیلۆمەترێك بەپێ بەشاخی سەخت و لێژدا هەڵگەڕێیت.

ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و ناوچەی پەکەکەوە نزیکەی ٣٠ کم دەبێت. بەشێوەیەکی سەرەکی ناوچەی موحەڕەمەیە و لەگەڵ ئەوەشدا چەندین گوندی تێدایە و بەرەسمی بەشێکن لە پارێزگای سلێمانی، حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٠ ەوە لەو ناوچەیەدا نییە. خەڵکی ناوچەکە خۆیان کاروباری ئیداری خۆیان بەڕێوەدەبەن لەو ناوچانەدا و پەکەکەش دەسەڵاتێکی زۆری لەو ناوچانەدا هەیە.

ژینگەکە روونیدەکاتەوە بۆچی پەکەکە بارەگایان لەوێ خستووە. ئەو شاخە نزیکەی ٣٥٠٠ مەتر لە ئاستی رووی دەریاوە بەرزە. سوپای تورکیا لە رابردوودا ئۆپراسیۆنی سەربازی ئەنجامداوە بۆ لەناوبردنی پەکەکە لە قەندیل، بەڵام هەرگیز سەرکەوتوو نەبوون.

لە خاڵی پشکنینەکەی پەکەکەدا، گەریلاکان مۆبایلەکانیان لێسەندین، هەرچەندە ئەو ناوچەیە لەدەرەوەی بازنەی خزمەتگوزاری مۆبایلیش بوو.

سەرچاوەکەمان عەبدەلڕەحمان چادرچی بە سەیارەیەك گەیشتە لای خاڵی پشکنینەکە کات و هیلاکی زۆری بۆ گێڕاینەوە کە ئەبوایە خۆمان بە شاخەکەدا هەڵگەڕاینایە، بۆ ماوەی نزیکەی ٢کم لەگەڵی سواربووین هەتا بەسەیارەکەیەوە لە شوێنێکدا وەستا. چاوپێکەوتنەکەمان لە قەدپاڵی لێژی شاخەدا ئەنجامدا، نەوەك لە بارەگاکەی پەکەکەدا و ڕێگەشیان پێنەداین وێنە بگرین.



چادرچی بۆ ماوەی، وەکو خۆی وتی، چەند خولەکێك جێماندەهێڵێت، بەڵام لە راستیدا ئەو چەند خولەکە دوو سەعاتی خایاند. ئەو فەرماندەیەی پەکەکە لەگەڵ کچە گەڕیلایەکی پەکەکەدا هاتەوە و پێی وتین ئەبێت چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەویش بکەین.

ئەم کچە گەریلایە ئەتوت مەشقی پێکراوە تا زانیاری نەدرکێنێت، هەموو پرسیارێکی زۆر بە کورتی وەڵام دەدایەوە، کە زۆربەی بەڵێ و نەخێر بوو، ئەمە یەکێك بوو لەو چاوپێکەوتنە خراپانەی کە تا ئێستا ئەنجاممداون، لەبەر ئەوە داوام لە چادرچی کرد کە ڕێگەمان بدات چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێکی تر بکەین. سەرەتا دڵی پێوە نەبوو، بەڵام دواتر بواری پێداین قسە لەگەڵ کچە گەریلایەکی تر بکەین کە لەوەی پێشوو کراوەتر بوو.

ئەزموونی ئەم جارە ئێجگار جیاواز بوو لە جاری پێشوو کە چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەندامانی پەکەکەدا سازکرد لە مانگی حوزەیراندا. ئەو کاتە، ئەمتوانی زۆربەی سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی پەکەکە ببینم. ڕێگەیان پێدەدام بە سەربەستی لە نێو کەمپەکەدا بسووڕێمەوە و چەند خەڵکم بوێت دیداریان لەگەڵ سازبکەم. ئەشمتوانی کەسی ڕێبەری خۆم هەڵبژێرم، بە پێچەوانەی ئەمجارەوە، کە هەستمدەکرد بەبەردەوامی لەژێر چاودێریدا بووم. پەکەکە پێیان وتم حەزەری لایەنی ئەمنی دەکەن.

ویستم شەو لەگەڵ پەکەکە بمێنمەوە بە هیوای ئەوەی زانیاری زیاترم دەستبکەوێت، بەڵام فەرماندەکە وتی نابێت بمێننەوە و ئەبێت بڕۆنەوە بۆ سلێمانی. ڕێبەرەکە وتی ناتوانن زەمانەتی گیانمان بکەن.

ئێوارە درەنگانێ گەیشتمەوە سلێمانی و دەستمکرد بە نووسینەوەی ستۆرییەکە. یەکسەر ستۆرییەکەم نارد و چەند پرسیارێکم لە موحەریرەکەمەوە بۆ هات. وادەیەکی دیاریکراوی توندیان بۆ دانابووم بۆ تەواوکردنی ستۆرییەکە، چونکە بارودۆخەکە بە بەردەوامی لە گۆڕاندابوو، ئێمەش لە کێبڕکێدابووین لەگەڵ دەزگاکانی تری هەواڵدا.

لە کۆتاییدا، ئەو ئەرکەی پێم سپێردرابوو بۆ نووسینی ئەو راپۆرتە شایستەی ئەو ماندووبوونە بوو، دڵخۆش بووم بەوەی چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەندامانی پەکەکەدا سازکردووە، چونکە چەند ڕۆژێك دوای سەفەرەکەم حکوومەتی هەرێم ڕۆیشتنی ڕۆژنامەنووسانی بۆ قەندیل و ناوچەکانی تری پەکەکە قەدەغەکرد.

## ستۆری تەحقیقی story investigation

بە شێوەیەکی گشتی ستۆری تەحقیقی وەك ئەوەی د. هاوارد باریل، مامۆستای ڕۆژنامەگەری بەریتانی، پێناسەی دەکات بریتییە لە پێشکەشکردنی وەڵامی شەش پرسیارە سەرەکییەکە (کێ، چی، کەی، کوێ، چۆن، بۆچی)، بەڵام بە شێوەیەك کە وردەکاری تەواوی ئەو زانیارییە شاراوانەش دەخاتەڕوو دەربارەی کێشەیەك یان ڕووداوێك یان دیاردەیەك، کە بەرژەوەندی گشتی پێویستی بە زانینی هەیە.

گرنگترین بنەمای ستۆری تەحقیقی بریتییە لە بەڵگە هێنانەوە و سەلماندن. هەڵبەت نابێت ئەو خاڵەش فەرامۆش بکرێت کە ستۆری تەحقیقی شتێکی ئەبستراکت نییە لە ژانرە ڕۆژنامەوانییەکانی تر، بەڵکو بە هەمان شێوەی ستۆری ئاسایی پەیڕەوی لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی ستۆری و ڕێوشوێنە سەرەتاییەکانی دیکەی هەموو کارێکی ڕۆژنامەوانی تێدا دەکرێت بۆ گەیشتن بە جەوهەری کێشەیەك یان بابەتێك.

ستۆری تەحقیقی تەنها دووبارە گێڕانەوەی زانیارییە کۆنەکان نین دەربارەی ڕووداوەکە بەڵکو دۆزینەوەی ڕاستی نوێ و دڵنیابوونە لە ڕاستبێژیان، بەواتایەکی دیکە ستۆری تەحقیقی گەڕانە بە شوێن کۆکردنەوەی پارچە جیاوازەکانی وێنەیەکدا کە دواجار بەهۆیەوە بیرۆکەیکی تێدا دەسەلمێنرێت، بێ گومان هەموو سەلماندنێکیش پێویستی بە بەڵگەی لۆژیکی هەیە، لەبەرئەوە کۆکردنەوە و خستنەڕووی بەڵگەی تەواو بۆ فەراهەمکردنی وێنە ڕاستەقینەکە لەسەر کێشەکە ڕوخساری سەرەکی ستۆری تەحقیقییە.

### قۆناغەکانی نووسینی ستۆری تەحقیقی

### ١- دەست پێکردن:

بۆ دەستپێکردنی ستۆری تەحقیقی زۆرجار ڕۆژنامەنووس پێویستە کار بە تیۆریەی موئامەرە بکات بۆ ئەوەی گریمانەیەك ساغبکاتەوە لە کێشەکەدا، دیارە ئەوەش بە بڕوای پسپۆڕانی بواری ڕۆژنامەگەری بە گەورەترین کێشە دادەنرێت لە ستۆری تەحقیقیدا، چونکە بێ ئەوەی ڕۆژنامەنووس هەستی پێبکات ڕوحی



دوژمنکارانەی تێدا سەوز دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بیرۆکەی ستۆری تەحقیقی لە شتێکی سادە یان دەنگوباسێکی بچووك یان پڕوپاگەندەیەکەوە دەستپێدەکات، بۆ نموونە کاتێك ئۆتۆمۆبیلێکی کەشخە بە بەرپرسێکی حکوومی دەبینی دوای ئەوەی ئەو بەرپرسە گرێبەستێکی لەگەڵ کۆمپانیایەکدا ئیمزا کردووە بۆ ئەنجامدانی پرۆژەیەك، تەنها ئەوە بەسە بۆ ئەوەی ستۆرییەکی تەحقیقی لەسەر ئەنجام بدرێت، چونکە پێدەچێت ئەو بەرپرسە ڕەشوەی لەو کۆمپانیایە وەرگرتبێت لە بەرامبەر پێدانی تەندەری پرۆژەکە بەو کۆمپانیایە، لێرەوە ڕۆژنامەنووس پێویستی بە کۆکردنەوەی زانیاری و داتا و بەڵگە هەیە بۆ سەلماندنی ئەو گریمانەیە.

### ٢- بەڵگە و سەلماندن:

گرنگترین ڕەگەز لە ستۆری تەحقیقیدا سەلماندنی ئەو بیرۆکە سەرەکیەیە، کە کێشە ڕاستەقینەکە دەخاتەڕوو، سەلماندنی بیرۆکەش لە ستۆری تەحقیقیدا پێویستی بە کۆکردنەوەی بەڵگە و داتا و زانیاری ورد هەیە، تا ئەوەی ڕۆژنامەنووس بتوانێت وێنە ڕاستەقینەکەی ڕووداوەکە بەرجەستە بکات، چونکە هەمیشە ستۆری تەحقیقی کار لەسەر کێشەیەك یان ڕووداوێك دەکات کە ڕوخسارە ڕاستەقینەکانی لە پشتی دەهلیزەکانەوەیە و لە دەرەوەی بینین و زانینی دەستەجەمعی کۆمەڵگەدایە. هەڵبەت ئەو پرۆسەیەش پێویستی بە گەڕان و پشکنین و ماندووبوونی زۆر هەیە، بۆ نموونە چۆن دەتوانین ڕاستی ئەو زانیارییە بسەلمێنین کە سەرچاوەیەك پێماندەڵێت، بۆ زامنکردنی ڕاستی زانیارییەکان پێویستە ڕۆژنامەنووس پشت بە سەرچاوەی ئاڵتوونی (سەرچاوەی سەربەخۆ) ببەستێت. دەبێت ڕۆژنامەنووس کاتێك ئایدیای ستۆرییەکەی دەستنیشان کرد بازنەیەك بکێشێتو هەموو ئەو لایەنانەی تێبکات کە پەیوەندیان بە کێشەکەوە هەیە، دواتر بۆ پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری ڕۆژنامەنووس پێویستی بەوە هەیە کە تەوەر و سەرچاوە پەیوەندیدارەکان بە کێشەکەیەوە دەستنیشان بکات. بۆ نموونە تەوەری یەکەم، سەرچاوە پەیوەندیدارەکانی دیاریدەکەین (A، D، F)، تەوەری دووەم سەرچاوە پەیوەندیدارەکان (B، C، E). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە هێڵکاری (پێنج).




تەنانەت ئەگەر زانیارییەکان لە بەڵگەنامە و دۆکیۆمێنتەکانیشەوە سەرچاوەی گرتبێت زامنی راستبێژی ئەو زانیاریانە ناکرێت ئەگەر بەهۆی سەرچاوەیەکی ئاڵتوونییەوە (سەرچاوەی سەربەخۆ) پشتڕاست نەکرابێتەوە، چونکە دۆکیۆمینتەکانیش ئەکرێت ساختە بکرێن. لەبەرئەوە ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە شوێنەوە هەبوو پێویستە رۆژنامەنووس بچێتە شوێنی رووداوەکە، ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە خەڵکەوە هەبێت دەبێت رۆژنامەنووس بیانبینێت و لێدوانی تەواویان لێوەربگرێت. خۆ ئەگەر کێشەکە پەیوەندی بە راستییەکی گریمانکراوەوە هەبوو بەبێ شایەدحاڵ و بەڵگەی تەواو ئەوا رۆژنامەنووس پێویستە (پلانی لێکۆڵینەوە) دابنێت.

**٣- پلانی لێکۆڵینەوە:**

بۆ ئامادەکردنی پلانی لێکۆڵینەوە، پێویستە رۆژنامەنووس رەچاوی دوو هەنگاوی گرنگ بکات، ئەوانیش :

یەکەم/ خشتەیەك بکێشە بۆ روونکردنەوەی شوناسی سەرچاوە پەیوەندیدارەکان و ئەو سەرچاوانەش کە ئەگەری ئەوەیان هەیە سوودیان لێوەربگیرێت، بۆ نموونە سەرچاوەی A قوربانی کێشەکەیە، سەرچاوەی E زیانلێکەوتووی کێشەکەیەو بەو شێوەیەی کە لەم خشتەیەی خوارەوەدا رونکراوەتەوە:



| زیانلێکەوتوو | قازانجکەر | دوژمن | دۆست | تاوانبار | قوربانی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| E | C | B | F | A | D |

پێویستە رۆژنامەنووس تەنها چاوی لەسەر سەرچاوە سەرەکی و دیارەکان نەبێت، چونکە ئەشێت سوود لە هەندێ سەرچاوەی ناسەرەکی و فەرامۆشکراو ببینێت، کە لەوانەیە زیاتر لە هەر سەرچاوەیەکی تر قسە بکەن و زانیارییان لابێت، بۆنموونە رەنگە کارمەندێکی ئاسایی کۆمپانیایەك یاخود فەرمانگەیەك کە رقی لە بەڕێوەبەرەکەیە، زانیاری و راستییەکان ئاسانتر ئاشکرا بکات.

دووەم/ ریزبەندی سەرچاوەکانت بکەو ئەوە دەستنیشانبکە کە لەکام سەرچاوەیانەوە دەستپێدەکەیت، چونکە ناکرێت رۆژنامەنووس بە دەستی خاڵی و بێ هیچ زانیارییەکی پێشوەخت بچێت سەرچاوەکان بدوێنێت، هەربۆیە پێش رووبەڕووبوونەوەی هەر سەرچاوەیەك پێوستە رۆژنامەنووس زانیارییەکی باشی لەسەر کێشەکە فەراهەم کردبێت، لەبەرئەوەی ئەگەر رۆژنامەنووس کێشەکەی بەشێوەیەکی سادەو بێ زانیاری درووژاند لای سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکان لەوانەیە ئەو سەرچاوەیە کاریگەری خراپی هەبێت لەسەر بێدەنگ کردنی سەرچاوەکانی تر یان هەر کێشەیەکی تر بۆ رۆژنامەنووسەکە دروستبکات.

ئەو دوو لیستەی بە پێی ئەو دوو هەنگاوە رۆژنامەنووس ئامادەی دەکات پێویستە بە بەردەوامی نوێی بکاتەوە، چونکە رەنگە کەسێك کە لە لیستی سەرچاوەی هاوڕێ تۆمارت کردبێت لە قۆناغێکی لێکۆڵینەوەکەدا ببێتە دوژمن. هەروەك دەبێت هەموو گۆڕانکاری و پێشهاتە تازەکان تۆمار بکەیت. هەندێ جار ئەگەر ئەو کەسانەی بەشێکن لە کێشەکە ئامادە نەبوون قسەت بۆ بکەن، ئیدی لەبەر هەر هۆکارێك بێت لە هۆکارەکان ، ئەوا پێویستە رۆژنامەنووس لەوکاتانەدا هەندێ لەو زانیارییە تایبەتانەی خۆی کە پێشتر لەسەر کێشەکە کۆیکردوونەتەوە، بۆیان

ئاشكرا بكات تا ئەوەی بیانهێنێتە قسەكردن ئەوەش بە زمانی عەرەبی پێی دەوترێ «الگعم» واتە ئەو خواردنەی لە تەڵەدا دائەنرێت.

### ٤- پرۆسەی چاوپێكەوتن:

دوای كۆكردنەوەی زانیاری و داتای تەواو لەسەر كێشەكە بۆ پشتڕاستكردنەوە و وەرگرتنی ئیقتیباسی پێویست دەربارەی مەسەلەكە، پێویستە چاوپێكەوتن لەگەڵ ئەو كاراكتەرە جیاوازانەدا بكرێت كە بەشێوەیەك لە شێوەكان پەیوەندیان بەو كێشەیەوە هەیە. چاوپێكەوتن گرنگترین و سەرەكیترین چەكی دەستی ڕۆژنامەنووسە بۆ تەواوكردنی بابەتی لێكۆڵینەوەكەی، لەم شێوە كاركردنانەدا چاوپێكەوتنەكان تەنها بریتی نین لە گفتوگۆیەكی سادەی پرسیاركردنو وەڵامدانەوە، بەڵكو زیاتر لە ڕووبەڕوو بوونەوە دەچێت وەك لە گفتوگۆیەكی ئاسایی، هەربۆیە پێویستی بە تەكنیك و ستایل و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە. هەموو چاوپێكەوتنێكی ڕەسمییش پێویستی بە سێ قۆناغی تایبەتی هەیە (پێش چاوپێكەوتن — كاتی چاوپێكەوتن - دوای چاوپێكەوتن).

لە بەشی دواتری ئەم كتێبەدا بە شێوەیەكی چڕو پڕ باس لە چاوپێكەوتن و تەكنیكە جیاوازەكانی دەكەین.

### چەند تێبینییەكی گشتی لەسەر كاری ڕۆژنامەنووسی تەحقیقی

١/ ستۆری تەحقیقی نابێت لە ١٥٠٠ وشە كەمتر و لە ٢٥٠٠ وشە زیاتر بێت.

٢/ ستۆری تەحقیقی پێویستی بە بەكارهێنانی ئیقتیباسی زۆرە هەروەكو پێویستیشە زانیاری زۆری تێدا بەكاربێت.

٣/بەپێی سروشتی خۆی لە ستۆری تەحقیقیدا ڕەنگە سەرچاوەكان بە زۆری ( off the record) بن، واتە نەیانەوێت ئاشكرا بكرێن و ناویان بهێنرێت، بۆیە دەبێت



ڕۆژنامەنووس ڕێككەوتن لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا بكات لەسەر ئەو سیغەیەی سەرچاوەكانی پێ دەنووسرێت.

٤/ ستۆری تەحقیقی پێویستی بە دوو بنەمای گرنگ هەیە بۆ بەرجەستەبوونی لە شێوەیەكی سەركەوتوودا، (جورئەتو تواناو پشوو درێژی) لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە، (جدیەت و هۆشیاری و متمانە) لە لایەن خوێنەرەوە.

٥/لە ستۆری تەحقیقیدا پێویستە ئیتیكەكانی كاری ڕۆژنامەنووسی و ئەخلاقیاتی ئەو پیشەیە بە شێوەیەكی ورد ڕەچاوبكرێ، چونكە بە پێی سروشتی خۆی ئەم كارە ڕۆژنامەنووسییە هەڵگری دۆخێكی هەستیار و ئاڵۆزە و بۆ خۆ دووركرتنی ڕۆژنامەنووس لە هەر لێپێچینەوەیەكی یاسایی بە هەندگرتنی ئیتیكەكانی كاری ڕۆژنامەنووسی لە هەرە پێداویستییە سەرەكییەكانە.

٦/ هەر بابەتێك لە ستۆری تەحقیقیدا پێویستی بە ستایل و شێوازێكی تایبەتی نووسین هەیە.

٧/ لە كاتی چاوپێكەوتنەكاندا ڕۆژنامەنووس دەبێت بەهرەمەند و كارامە بێت و بتوانێت متمانەی سەرچاوەكانی بەدەست بهێنێت.

٨/ هەندێ جار ئیقتیباس و زانیاری ئەبستراكت ناتوانن ڕەگەزی تەحقیق یان سەلماندنەكە لە ستۆری تەحقیقیدا تەواو بكەن هەربۆیە ڕۆژنامەنووس دەتوانێت چەند بۆكسێكی تر بۆ بەهێزكردنی ستۆرییەكەی بەكاربهێنێت وەكو فۆتۆ، نەخشە، گرافیك، دۆكیۆمێنت، ئەرشیف.

٩/ بۆ ساغكردنەوەی ڕاستی مەسەلەكان هەموو زانیارییەك چەند بچوك و كەمبایەخیش بێت لە ستۆری تەحقیقیدا پێویستە، لەبەرئەوە ڕۆژنامەنووس نابێت موستەغنی بێت لە هەر زانیارییەكی بچوك و لاوەكی كە دەستی دەكەوێت، چونكە دەشێت لە یەكێك لە پەرەگرافەكانی ستۆرییەكەدا پێویستت بێت بۆ سەلماندنی ڕاستییەك.

١٠/ بەکارهێنانی ریکۆردەر باشیو خراپی خۆی هەیە، لە لایەك ریکۆرد کردنی چاوپێکەوتنەکان گرنگن چونکە لەوانەیە دوای بڵاوکردنەوە هەندێ لەوانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکەی پەشیمان ببنەوە لەو شتانەی وتوویانە، بەڵام ئەگەر لێدوانەکانت تۆمارکردبێت، ئەوا ئەگەری دروستبوونی ئەو کێشەیە لە خۆت دوور دەخەیتەوە. لە هەمانکاتیشدا بەکارهێنانی ریکۆردەر ئەو خراپیەشی هەیە کە ئەو کەسەی قسەت بۆ دەکات رەنگە زانیاری باشیشی لە لابێت بەڵام کاتێك ریکۆردەرەکە دەبینێ لە رووی سایکۆلۆژییەوە توشی دڵەڕاوکێ دەبێت و ئەوکات لەوانەیە خۆپارێزی لە وتنی هەندێ راستی گرنگ. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە رۆژنامەنووس پێشتر شێوازی گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ کەسی مەبەستدا روون بکاتەوە.

### کێشەکانی ستۆری تەحقیقی:

کاری رۆژنامەنووسی لە وڵاتی ئێمەدا پڕیەتی لە کێشەو دەردەسەری، نەخاسمە رۆژنامەگەری تەحقیقی کە بە سروشتی خۆی کارێکی ئاڵۆز و پڕ کێشەیە و رۆژنامەگەری تەحقیقی خۆی لە خۆیدا شێوەیەکە لە موجازەفەکردنو سەرکەشی، هەربۆیە پێویستە رۆژنامەنووس پێش دەستپێکردنی کارێکی رۆژنامەنووسی تەحقیقی هۆشیاری تەواوی هەبێت دەربارەی ئەو کێشانەی دێنە رێگەی بە ئەنجامگەیاندن و بە پایانگەیاندنی کارەکانی، جا ئەوە پێش بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی بێت یان دوای بڵاوکردنەوە، بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین کێشەکانی ستۆری تەحقیقی لە چەند خاڵێکدا دەستنیشان بکەین:

**١- ستۆری تەحقیقی پێویستی بە تیۆریەی موئامەرە (نظرية المؤامرة) هەیە:**

بەوپێیەی سەلماندنی بیرۆکە رەگەزێکی سەرەکییە لە رۆژنامەگەری تەحقیقیدا، بۆیە رۆژنامەنووس زۆرجار ناچارە بە تیۆریەی موئامەرە مامەڵە لەگەڵ رووداوەکاندا بکات و پێدراوەکان لەسەر کێشەکە هەڵسەنگێنێت، تا ئەوەی وێنە گشتییەکەی دەستبکەوێت، ئەمەش زۆرجار بەبەریەوە هەیە هەستێکی شەڕەنگێزو نا بێلایەنی



لای رۆژنامەنووسەکە دروستبکات و کار لە ئیتیکە رۆژنامەوانییەکەی بکات بە تایبەتی لە مەسەلەی وردکاریی و پاکیدا وەك دوو ئیتیکی ستانداردی کاری رۆژنامەوانی، بەو پێیەی لە دەستدانی بێلایەنی رۆژنامەنووس دوور دەخاتەوە لە رەهەندی پرۆفیشناڵ بوون، لە لایەکی ترەوە کارکردن بە تیۆریەی موئامەرە ئەو ئەگەرە بەهێز دەکات کە خراپ بەکارهێنان و خراپ تەوزیفکردنی ئامانجە رۆژنامەوانییەکانی لێبکەوێتەوە، چونکە زۆرجار ئەو سەرچاوانەی زانیاری دەدەن لەوانەیە مەبەستی تایبەتی و شەخسیان بخەنە پێش بەرژەوەندی گشتی و چاکەی دەستەجەمعی کۆمەڵگاوە، هەربۆیە ئەگەر رۆژنامەنووس زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوت نەکات لەوانەیە بە ئاسانی لە لایەن سەرچاوەی زانیارییەکانییەوە بقۆزرێتەوە و کارە رۆژنامەوانییەکەی دواجار لە بری ئەوەی برژێتە مەجرای بەرژەوەندی گشتیەوە دەبێتە میکانیزمێك بۆ بەرجەستەکردنی بەرژەوەندی لایەنێك و لێدان لە بەرژەوەندی لایەنێکی تر یان ببێتە سەرچاوەیەك بۆ دروستکردنی شەڕانگێزی و رق و توندوتیژی ئەوەش نەك کارێکی رۆژنامەگەری تەحقیقی نابێت بەڵکو هەر دوور دەکەوێتەوە لە خودی کاری رۆژنامەوانی شایستە، کە گواستنەوەی زانیاری و رووداوەکانە بە شێوەیەکی بێلایەن بۆ خوێنەران و هاوڵاتیان بەگشتی.

**٢- کێشەی چاپو بڵاوکردنەوە:**

کێشەی بڵاوکردنەوە و چاپکردنی کاری رۆژنامەوانی تەحقیقی یەکێکە لە هەرە کێشە گەورەکانی بەردەم ئەو بوارە، بە تایبەتی لەو وڵاتانەی کە خاوەنی ئەتمۆسفیرێکی سیاسی تۆتالیتارو نالیبڕاڵن و دیموکراسیەت و بنەماکانی ئازادی رادەربڕین نەبووەتە کەلتوورێکی سیاسی و یاسایی حکوومەت. هەربۆیە هەندێ جار رۆژنامەنووس ستۆرییەکی تەحقیقی پڕ بایەخ ئامادە دەکات بەڵام ناتوانێت بڵاویبکاتەوە چونکە بە بڵاوکردنەوەی رەنگە یان دەزگا رۆژنامەوانییەکەی دابخرێت لە لایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە یان خودی خۆی رووبەڕوی هەڕەشە و مەترسی

زیندانیکردن و کوشتن ببێتەوە، ئەمەش مانای وایە ڕۆژنامەنووس وەکو چۆن پێویستە لە قۆناغەکانی ئامادەکردنو نووسینی ستۆرییەکەیدا هۆشیارو بە ئاگا بێت، ئاوهاش پێویستە زۆر بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ چۆنێتی ستۆرییەکەی بکاتەوە و ئەگەرە جیاوازەکانی لێکبداتەوە، ئەویش بەم ڕێگایانەی خوارەوە، هەڵبەت ئەمەش ترسنۆکی ڕۆژنامەنووس ناگەیەنێت بەقەد ئەوەی هێمایەکی بەهێز بۆ کارامەیی‌و سەلیقەی ڕۆژنامەنووسەکە پیشاندەدات:

- لە ستۆرییەکی تەحقیقیدا ئەگەر بابەتەکە لەسەر دۆخێکی گشتی بوو وەکو پارە بە فیڕۆدان، نەدانی مووچە، وەرگرتن و خواردنی بەرتیل، ئەوا واباشترە تەرکیز نەکرێتە سەر کەسانی دیاریکراو و بەرپرسیارییە کەسییەکانیان، بەڵکو دۆخە گشتییەکە نیشانبدرێ، هەروەك دەشتوانرێت پۆستەکانیان بنوسرێت بەبێ ناوهێنانی کەسە تێوەگلاوەکان، ئەمەش باشترین ئەڵتەرناتیڤە بۆ خۆ بەدوور گرتن لە پەرچەکرداری مەترسیدار لە لایەن کەسەکانەوە.
- باشترین ڕێگەچارە بۆ خۆپاراستن لە هەڕەشە و کاردانەوە خراپەکانی لایەنە تێوەگلاوەکانی کێشەیەك یان ڕووداوێك ئەوەیە کە ڕۆژنامەنووسەکە هەموو ئەو زانیارییە جەهەنەمیانە بڵاونەکاتەوە لەسەر کێشەکە، بەڵکو بەشێکی لای خۆی گلبداتەوە چونکە هەروەك کریسۆڤ ڕۆیتەر پەیامنێری گۆڤاری (شتێرن)ی ئەڵمانی ئاماژەی بۆ دەکات لە ئەڵمانیا زۆرجار ئەو تەکنیکە بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی سەلماندنی تازە شایەتحاڵ و زانیاری زیاتر بە دەستبهێنن لەسەر کێشەکە، هەروەك بڵاوکردنەوەی بەشێك لە زانیارییەکان و هێشتنەوەی بەشێکی تری دەشێت بکرێتە تاقیکردنەوەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی ئاستی کاردانەوە و پەرچەکرداری لایەنە تێوەگلاوەکان، سوودێکی تری ئەو تەکنیکە ئەوەیە کە وا لە کەسە تێوەگلاوەکان دەکەیت نەتوانێت هەڕەشە یان مەترسیت بۆ دروستبکات چونکە ئەگەر بزانێت زانیاری زیاترت لەسەر کێشەکە هەیە خۆدەپارێزێ لەوەی هەڕەشەت لێبکات، هەڵبەت هەموو ئەوانەش پابەندی جورئەت و سەلیقە و کارامەیی ڕۆژنامەنووسەکە و جۆری بابەتی ستۆرییە تەحقیقییەکەیە.



- ئەگەر هەموو ئەوانەی باسکران سوودی نەبوو یاخود ڕۆژنامەنووسەکە ستۆرییەکی تەحقیقی بەهێزی ئامادە کردبێت و سور بزانیت بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە یان گۆڤارەکەی دادەخرێت، ئەوا باشترە کە لە دەزگایەکی ڕۆژنامەوانی نێودەوڵەتی یان ئاژانسێکی هەواڵی جیهانی بڵاوبکرێتەوە، وەکو ئاژانسی ڕۆیتەرز یان ئەسیۆشەیتدپرێس یاخود IWPR ، دواتر دەتوانرێت چەند پەرەگرافێك یان چەند ئیقتیباسێك لەوێ وەربگرێت و بڵاویبکاتەوە، ئەوەش دوا دەرفەت و ئەڵتەرناتیڤە بۆ چارەسەری کێشەی چاپ و بڵاوکردنەوە.

## ٣- کێشە و مەترسی دیکە:

زۆرجار کارکردن لە بواری ڕۆژنامەگەری تەحقیقی پێویستی بە جۆرێك لە لێکۆڵینەوەی پۆلیسی هەیە، ئەوەش هەندێ کات ڕۆژنامەنووس دەخاتە هەڵوێستێکەوە کە ڕەنگە تووشی لێپێچینەوەی ئەخلاقی و یاسایی بکات، بە واتایەکی دیکە ڕۆژنامەنووس لە پرۆسەی گەڕان و کۆکردنەوەی زانیاری و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەدا بۆ بەپایان گەیاندنی ستۆرییەکی تەحقیقی پێویست بەوە دەکات جۆرێك لە کاری پۆلیسی ئەنجامبدات، بۆ نموونە ڕۆژنامەنووس ناچار دەبێت کۆمەڵێك سەرچاوە پەیدا بکات و بە نهێنی لێدوان و زانیارییان لێوەربگرێت کە بە شێوەیەکی فەرمی ڕێگەپێدرا و نەبن لەو دەزگایەدا لێدوان بۆ ڕۆژنامەنووسان بدەن، بەڵام تۆ ناچاریت ئەو ڕێگایە بگریتە بەر چونکە دەتەوێت ڕاستی ڕووداوێك ئاشکرا بکەیت، یان هەندێ جار ڕەنگە بەڵگەنامەیەکت دەست نەکەوێت ئەگەر ڕێگەیەکی سیخوڕیانە بەکارنەهێنیت بۆ دەستخستنی ئەو بەڵگەنامەیە، یان لەوانەیە پێویستت بەوە هەبێت بە نهێنی و بێ ڕوخسەتی کەسی مەبەست فۆتۆیەکی بگریت، هەرچەندە دروستی و یاسایی بوونی ئەم شێواز و میکانیزمە جیاوازانە پەیوەندی بە کەلتوور و یاسای ڕۆژنامەوانی وڵاتەکەوە هەیە، بەڵام لە زۆربەی بارودۆخەکاندا ڕۆژنامەنووس ناچارە ئەو ڕێگایانە بگرێتە بەر بەتایبەتی لە وڵاتێکی وەکو ئێمە کە زۆربەی فاکتەرە

بابەتییەکان هاوکار نین بۆ ڕۆژنامەنووسان و ئاشکراکردنی زانیارییەکان. هەربۆیە ستۆری تەحقیقی هەڵگری ئەو کێشانەشە کە بەشێوەیەکی گشتی ڕۆژنامەنووس دەخاتە هەڵوێستێکەوە ڕەنگە تووشی لێپێچینەوەی ئەخلاقی و یاسایی بکات.

**نموونەیەکی ستۆری تەحقیقی**

**زۆروزەوەندیی نەوتی خاوی کوردستان کێشمەکێش ئەنێتەوە**

**شەڕێکی سیاسی لە سەرهەڵداندایە لەسەر کۆنترۆڵکردنی سامانی گەورەی نەوتی باکوور**

فرمان عەبدولرەحمان بە هاوکاریی پەیامنێرانی (IWPR) لە کوردستان بۆمەلەرزەناسێکی ئەڵمانی کە لە باکووری عێراق کاردەکات نەدەبوایە دەربارەی کارەکەی قسەبکات. بەڵام دوای بەسەربردنی نزیکەی سێ مانگ لە کەمپێکی دابڕاودا نزیك چاڵە نەوتەکانی تەق تەق، ئیتر چیتر خۆی پێنەگیرا.

ئەو زانایە کە نەیویست ناوی بهێنرێت وتی، «لە کوێ ئەتەوێت ئەتوانیت بیر لێبدەیت و یەکسەریش نەوتی لێهەڵدەقوڵێت».

بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵە، کۆمپانیا بیانییەکان بۆ نەوت دەگەڕێن و نەوت دەدۆزنەوە لە هەرێمی کوردی نیمچە سەربەخۆی عێراقدا. لەوانەیە کێڵگەی گەورەیان نەدۆزیبێتەوە، وەکو کێڵگەی بەناوبانگی «بابەگوڕگوڕ»ی نزیك کەرکوك، بەڵام کۆمپانیاکانی نەوت و هاوبەشە کوردەکانیان زۆر بەوە دڵخۆشن.

ساغبۆتەوە کە عێراق ١١٥ ملیار بەرمیل نەوتی یەدەگی هەیە، بەڵام وای بۆ دەچن سامانە نەوتییە فیعلیەکەی ئێجگار لەوە زیاتر بێت. کوردستانی عێراق و ناوچەی کەرکوکی بە نەوت دەوڵەمەند ناوچەی سەرەکین بۆ ئەو کەسانەی لە بازاڕی نەوتدا بۆ قازانج دەگەڕێن لەبەرئەوەی نەوتی یەدەگی ئەو ناوچانە زۆر گەورەیە، ئیدی چ ئەو یەدەگەی کە دڵنیان لە بوونی و چ ئەوەی ئەگەری بوونی هەیە.

سێ پارێزگاکەی کوردستانی عێراق لە باکووری ئەو وڵاتە، کە ئارامترین ناوچەن لە عێراقدا و ئەمەش هۆکارێکی ترە بۆ ڕاکێشانی ئەوانەی بۆ نەوت دەگەڕێن و



ئەوانەشی وەبەرهێنان دەکەن لە بواری نەوتدا. حکوومەتی هەرێمی کوردستان، بەردەوامبووە لە گەڕان بۆ دۆزینەوەی نەوت لە باکوور لە ڕێگەی مۆرکردنی گرێبەستەوە بۆ دۆزینەوە و گەڕان بۆ نەوت لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکاندا.

ئەمەش لێپرسراوانی نەوتی لە حکوومەتی مەرکەزی بەغدا سەغڵەتکردووە، بەڵام ئەم نەوتەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان سەرمایەگوزاری تێدادەکات مسۆگەر نییە. ئەوەشی هەڕەشەی لێدەکات ئەو نادڵنیاییەیە کە دەوری ئەو یاسا نیشتمانییە نوێیەی داوە کە سەبارەت بە یەدەکی نەوتی عێراق دەرکراوە، ئەمە جگە لەوەی مەترسی تورکیا لە هێزی کورد و هەروەها فشاری گرووپە ئیتنییە ڕکابەرەکان کە ناوچەکانیان ئەوەندە کانگای سروشتی تێدانییە وەکو ناوچەکانی تری عێراق.

لە سەرەتای ٢٠٠٦دا، یەکەم کۆمپانیای بیانی دەستیکرد بە بەرهەمهێنانی نەوت لە کوردستان، کۆمپانیای (Det Norske Olijeselskap) نەرویجی ناسراو بە کۆمپانای (DNO) دوو ڕێکەوتننامەی بەرهەمهێنانی نەوتی لەگەڵ حکوومەتی هەرێم مۆرکرد لە ٢٠٠٤ دا، کە بەپێی ڕێکەوتننامەکە بەرهەمەکە دابەشدەکران لە نێوانیاندا، کە ٥٥٪ ی سەرمایەگوزارییەکەی بەردەکەوت لە هەردوو گرێبەستەکەدا. کۆمپانیای (DNO) 10% تا ٣٠٪ ی بەردەکەوت لە قازانجەکەدا و ئەوی تریشی دەڕۆیشت بۆ هەرێم. لە سەرەتادا، کۆمپانیای (DNO) وای مەزەندەکرد کە کێڵگەی نەوتی (تاوکی)ی نزیك شاری دهۆك ١٠٠ ملیۆن بەرمیل نەوتی تێدایە و ڕادەی بەرهەمهێنانیشی دەگاتە ئەوپەڕی ٥٠ هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا لە ساڵی داهاتوودا، بەڵام وادیارە ئەو کێڵگە نەوتیە زۆر لەوە زیاتری تێدایە.

نوێترین ئیشی ئەو کۆمپانیایە لە تاوکی تێکڕای بەرهەمهێنانەکەی ١٢ هەزار بەرمیلە لە ڕۆژێکدا، کە ٤٠٪ی زیاترە لە بیرێکی تر لە هەمان ناوچەدا. کۆمپانیای (DNO)، 80 لۆری هەیە کە ڕۆژانە ١٠ هەزار بەرمیل لەو شوێنەوە دەگوازنەوە. ئەکرێت تێکڕای بەرهەمهێنان بگاتە ٢٠ هەزار بۆ ٢٥ هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا،

بەڵام پێدەچێت گواستنەوەی ئەم برە لە نەوتی خاو بە ڕێگەی وشکانیدا لە رووی لۆجیستیەوە قورس و لە رووی تێچوونەوە گران بێت.

قۆناغی دووەمی بیرلێدان لە مانگی مایسی ٢٠٠٦ دا لە ناوچەی تەق تەقی باشووری سلێمانی دەستپێکرد، لە لایەن کۆمپانیای وەبەرهەێنانی تەق تەق کە بە کۆمپانیای (TTopco)ش ناسراوە، لەگەڵ کۆمپانیای (Addax Petroleum) کە کۆمپانیایەکی سویسری-کەنەدیە. کۆمپانیای (TTopco)، کە سەرمایەگوزارییەکی هاوبەشە لەگەل کۆمپانیای (Genel Enerji) ی تورکی، ئێستا چوارەم بیری نەوت لێدەدات و بەهیوایە تا کۆتایی ٢٠٠٧ دوو بیری تر لێبدات.

کەمال ئەفەرەجی، لێپرسراوێکی کۆمپانیای (TTopco) رایگەیاند ئەو سێ بیرە نەوتەی کە کۆمپانیاکە لێیداوە وا چاوەڕواندەکرێت رۆژانە ٧٥ هەزار بەرمیل بەرهەمبهێنێت. یەدەگی نەوت لە تەق تەق بە ١,٢ ملیار بەرمیل مەزەندەدەکرێت. چەند کۆمپانیایەکی تری وەکو (Western Oil Sands) و ( Heritage Oil Corp)ی کەنەدی و کۆمپانیای (Sterling Energy)ی بەریتانیش خەریکی پشکنینی ناوچەکەن بۆ نەوت.

کوردستان ئەیەوێت بەرهەمی نەوت بگەیەنێتە ٢٠٠ هەزار بەرمیل لە رۆژێکدا تا کۆتایی ساڵی داهاتوو، ئەو بڕەش بۆ یەك ملیۆن بەرمیل زیاد بکات لە ماوەی پێنج ساڵدا.

هەرچەندە یەدەگە نەوتییەکانی باکووری عێراق هێندەی ئەوانەی کێڵگە گەورەکانی باشوورو دەوروبەری بەسرە زۆر نین، بەڵام ئاشتی هەورامی وەزیری سەرچاوە سروشتییەکان دەڵێت ناوچەکە «ئەگەرێکی باشی» هەیە و یەدەگەکەی بە نزیکەی ٢٥ ملیار بەرمیل نەوت و ١٠٠ تریلیۆن پێ سێجا لە غازی سروشتی مەزەندە دەکات.

هەروەها ئەگەری ئەوەشی باسکرد کە بە هیوان بۆری دووەمی هەناردەکردنی نەوت لە کەرکوکەوە بۆ بەندەری جیهانی تورکی رابکێشرێت، کە بە ناوچەکانی ژێر



دەسەڵاتی کوردستاندا تێدەپەرێت، بەمەش باشتر دەپارێزرێت لەو هێرشە تێکدەرانەی دووچاری بۆرییە نەوتەکانی تر بوونەتەوە لە شوێنەکانی تری وڵاتدا.

تەنها کەرکوك ١٠ ملیار بەرمیل نەوتی یەدەگی هەیە و ئاشتی هەورامی ئاماژەی بەوەکرد بە مەزەندەی ئەو ٢٠ ملیار بەرمیل نەوتی تر کەوتۆتە شوێنە ناکۆکەکانی تری باکوورەوە. بەپێی ئەو خەمڵاندنانە، ئەگەر کورد کۆنترۆڵی باکوور بکەن لەوانەیە چەند بەشێك لە پارێزگای نەینەوا، کە ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان ئامادەییەکی سیاسی و ئەمنی هەیە تیایدا و یەدەگە مەزەندەکراوەکانی دەگاتە نزیکەی ٥٥ ملیار بەرمیل نەوت، یان نزیکەی نیوەی یەدەگی نەوتی عێراقی کە تا ئێستا پێیزانراوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کوردی عێراق نەوتیان لە نایجیریا زیاتر دەبێت کە گەورەترین بەرهەمهێنەری نەوتە لە ناو وڵاتەکانی ئەفریقادا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەسێکیش بەم ئەگەرانە شاگەشکە نەبووە.

ئەو ریفراندۆمەی بڕیارە ئەنجامبدرێت یەکلاییدەکاتەوە ئایا کەرکوك و چەند ناوچەیەکی ناکۆکی تر دەکەونە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە یان نا. بەڵام ناکۆکی سیاسی لە نێوان سەرکردە کوردەکان و عەرەبەکان سەبارەت بە وادەی ئەنجامدانی راپرسییەکە، لەوانەیە دەنگدانەکە بۆ ساڵی ٢٠٠٨ یان دواتریش دوابخات.

تورکیاش، رازی نییە بەوەی کورد کەرکوك ببات، چونکە لەوە دەترسێت کە بوونی هەرێمێکی کوردی زۆر بەهێز هاوڵاتییە کوردەکانی تورکیاش هانبدات داوای مافی سیاسی بکەن. تورکیا کە تورەیە لەم بارودۆخە، ئەتوانێت پایەیەکی ستراتیجی نەوتی کورد لاوازبکات ئەوەش بەوەی رێگەبگرێت لەو هەرێمە داخراوە و مەنفەزێکی نەداتێ بۆ هەناردەکردنی نەوت.

سۆنەر جەگەپتای بەڕێوەبەری بەرنامەی لێکۆڵینەوەی تورکیا لە پەیمانگای واشنتۆن بۆ سیاسەتی خۆرهەڵاتی نزیك وتی «کوردی عێراق هیچیان نابێت ئەگەر نەتوانن نەوتەکەیان بنێرنە دەرەوە.»

هەروەها تەگەرەیەکی گەورەتریش هەیە کە سەرجەم هەوڵەکانی دۆزینەوەی نەوت دەگرێتەوە لە کوردستاندا، ئەویش یاسایەکی نوێی تایبەت بە نەوتە کە دیاریدەکات پێویستە کێ کۆنترۆڵی کێڵگەکانی نەوت بکات و چۆن داهاتەکانی دابەشبکرێت. کورد سوورە لەسەر ئەوەی دەسەڵاتدارانی لۆکاڵی وەکو حکوومەتی هەرێمی کوردستان مافی بەڕێوەبردنی پڕۆژە نەوتییەکان و مۆرکردنی گرێبەستیان هەبێت، کە ئەمانەش خاڵی ناکۆکین لەگەڵ هەندێك لە لێپرساوە عێراقییەکاندا.

لە سەرەتای تەمموزدا، نوری مالیکی سەرەك وەزیران رایگەیاند کابینەکەی پڕۆژە یاسای نەوتی پەسەندکردووە و بەتەمایە بینێرێت بۆ پەرلەمان. لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەنووسیدا، مالیکی ئەو یاسایەی وەکو «گرنگترین» یاسا وەسفکرد لە ناو یاساکانی عێراقدا.

بەڵام تەنها پاش چەند رۆژێك، سەرباری گرەنتییەکانی مالیکی کە پڕۆژە یاساکە بەوزوانە لە پەرلەماندا گفتوگۆ دەکرێت، سەرکردە کوردەکان و هەموو گرووپە سوننییەکان و هەر٣٠ ئەندام پەرلەمانەکەی سەر بە موقتەدا سەدر، دژی پڕۆژە یاساکە وەستانەوە. هەرچەند سەرکردە کوردەکان لە کابینەکەی مالیکیدا بەشدارن، بەڵام حکوومەتی هەرێمی کوردستان رایگەیاندبوو تەنانەت دواهەمین رەشنووسی یاساکەیان نەبینیوە، لەبەر ئەوە پشتگیری لێناکەن.

حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە بەیاننامەیەکدا وتی «هیوامان وایە ئەو کابینەیە دەقێك پەسەند نەکات کە جێگەی رەزامەندی حکوومەتی هەرێمی کوردستان نەبێت، چونکە ئەمە پێشێلکردنی مافە دەستوورییەکانی هەرێمی کوردستانە.»

مەسەلەی سەرەکی کورد تایبەتە بە کۆنترۆڵکردن و بەڕێوەبردنی ئەو کێڵگانەی نەوت کە لە ئایندەدا دەدۆزرێنەوە. هەرچەندە مادەی ١٨٠ی دەستووری عێراقی ئەڵێت «نەوت و غاز موڵکی هەموو خەڵکی عێراقە» و دەبێت لەلایەن حکوومەتی فیدراڵییەوە بەڕێوەڕببرێت بە پەیوەست لەگەڵ حکوومەتە هەرێمییەکان، بەڵام تەنها



کێڵگە نەوتییەکانی ئێستا کە حکوومەتی مەرکەزی کۆنترۆڵیکردووە، ناویانهێنراوە، نەوەك ئەو کێڵگە نەوتیانەی کە لەوانەیە لە دوارۆژدا بدۆزرێنەوە. زۆرێك لە دیبەیتەکانی تایبەت بە یاساکە لەسەر دەستوورەکەی ٢٠٠٥ ە کە بە زاراوەی تەمومژاوی نووسراوە بۆ خاتری فەراهەمکردنی پشتگیرییەکی بەرفراوان.

حکوومەتی هەرێمی کوردستان روونیکردۆتەوە کە ئەیەوێت خۆی لەسەر گرێبەستەکانی خۆی رێکبکەوێت و مۆریان بکات و نارازیە لەو پاشکۆیانەی خراونەتە سەر پڕۆژە یاساکەی ئێستا کە کۆنترۆڵکردنی ٩٣٪ی کێڵگە نەوتییەکان ئەخاتە ژێر دەسەڵاتی دامەزراوەیەکی سەر بە دەوڵەت کە ئەویش کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی عێراقییە کە بڕیارە پاش دەرچوونی یاساکە دابمەزرێنرێت.

پڕۆژە یاساکەی نەوت ئێستا راگیراوە چونکە پەرلەمان لە ماوەی مانگی ئابدا لە پشوودابوو.

وەزیری سەرچاوە سروشتییەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، ئاشتی هەورامی لە ماوەی چەند مانگی رابردوودا ئاماژەی بەوە کردبوو کە ئیدارەی کوردی بەردەوامدەبێت لە گەڵاڵەکردنی یاسای نەوتی تایبەت بە خۆی و چاوەڕێی بەغداد ناکات یاسای نیشتمانی دەربکات. پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە سەرەتای ئابدا بەم کارە هەستا کاتێك یاسای خۆی دەرکرد بۆ رێکخستنی بەڕێوەبردنی نەوت لە هەرێمی باکووردا.

سەرەك وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان نێچیرڤان بارزانی لە بەیاننامەیەکدا وتی کە دەرکردنی ئەم یاسایە «ساتەوەختێکی مێژوویی بوو کە لە چەندەها ساڵی داهاتوودا یادی دەکرێتەوە.»

بەپێی یاساکە کۆمپانیایەکی نەوتی هەرێمیی دادەمەزرێت بۆ بەگەڕخستنی کێڵگەکانی نەوت لە کوردستانی عێراقدا و پێش لەسەرە ئەوە دادەگرێت کە پێویستە حکوومەتی هەرێمی کوردستان رۆڵێکی هاوبەشی هەبێت لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی عێراقیدا لە بەڕێوەبردنی کێڵگە نەوتەکانی ئێستا و لە پارێزگا

کوردییەکاندا. یاساکە داوای ئەوە دەکات کە حکوومەتی مەرکەزی عێراقی ڕێگە بە ئیشکردن نەدات لە ناوچە ناکۆکەکاندا وەکو کەرکوك هەتا ئەو کاتەی ریفراندۆمەکە بڕیاردەدات پێویستە کێ حوکمیان بکات.

دەستووری عێراقی داوای ئەوە دەکات داهاتەکانی نەوتی عێراق بە یەکسانی دابەشبکرێت، بەڵام یاساکەی حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش ئەڵێت داهاتەکانی نەوت دەنێردرێن بۆ حکوومەتی مەرکەزی. بەڵام دەسەڵاتێکی هەرێمیی زیاتر دەبەخشێتە هەرێمی کوردستان، زیاتر لەوەی هەندێك لە لێپرسراوە عێراقیەکان پێیانخۆشە کە حکوومەتە هەرێمییەکان هەیانبێت.

لە بەیاننامەیەکدا هەر دوای پەسەندکردنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بۆ یاسای نەوتی هەرێمی کوردستان، دەستەی زانایانی موسڵمان (هیئە علماو المسلمین) کە گرووپێکی خاوەن نفوزی سوننەی عەرەبە، ووتیان کە سیاسەتمەدارانی کورد «نوێنەری رەسمی عێراقیەکان یان کوردەکان نین». ئەو دەستەیە هەروەها هۆشداریدایە کۆمپانیا بیانییەکان کە ئیش لەگەڵ «بە ناو حکوومەتی کوردی» نەکەن.

باوەڕناکرێت زۆربەی ئەو ناوچانەی عەرەبی سوننە کۆنترۆڵیکردوون لە عێراقدا نەوتی تێدابێت، هەروەها سەرکردە سوننەکانیش پشتگیریی لە دەسەڵاتێکی تۆکمەی حکوومەتی مەرکەزی دەکەن بەسەر داهاتی نەوت و بەڕێوەبردنی ئەو داهاتەدا.

کوردەکان بۆچونیان جیاوازە، لە بەیاننامەیەکدا، هەورامی هێمای بەوەدا کە «بە پێی دەستووری عێراق، بەڕێوەبردنی نەوت و غاز بەشێویەکی سەرەکی مافێکی هەرێمیە، سەرکەوتنیشمان دەوەستێتە سەر مومارەسەکردنمان بۆ ئەو مافە. ئەم یاسایەی هەرێمی کوردستان بەرجەستەکردنی ئەو مافەیە.»

هەروەها کێشەش هەیە لە نێوان حکوومەتی مەرکەزی و دەسەڵاتدارانی کورددا لەسەر گرێبەستەکانی ئێستا. لە مانگی ئاداری ٢٠٠٧ دا، وەزیری نەوتی عێراقی



حسێن شەهرستانی ئاماژەی بەوەدا کە رێکەوتن لەگەڵ کۆمپانیای (DNO) پێدەچێت یاسایی نەبێت چونکە حکوومەتی مەرکەزی پەسەندی نەکردووە.

لە کۆبوونەوەیەکی وڵاتانی (OPEC) دا لە ڤیەننا، شەهرستانی وتی «هەموو ئەو گرێبەستانەی چ لەلایەن رژێمی پێشوەوە یان لەلایەن هەرێمی باکوورەوە مۆرکراون، پێویستە بەپێی مەرجەکانی یاسا نوێیەکە بێت».

بە گوێرەی ئاژانسەکانی هەواڵ، شەهرستانی لە کۆنفرانسێکدا لە مانگی مایسدا لە وڵاتی سعودیە وتوویەتی هەر گرێبەستێك کە لەلایەن کوردەوە پێش دەرکردنی یاسای نەوتی فیدراڵی مۆکراوە بە ناکارا و نایاسایی لەقەڵەمدەدرێت.

بارزانی پێداگری لەسەر ئەوە کرد کە گرێبەستەکان یاسایین و بەیاننامەیەکی دەرکرد و تیایدا ئاماژەی بەوەدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کە لەوانەیە حکوومەتەکەی جیاببێتەوە ئەگەر گرێبەستەکان پوچەڵبکرێنەوە. هەروەها وتیشی «ئەگەر وەزیرەکانی بەغدا مل نەدەن بە دەستوور، خەڵکی کوردستان بە مافی خۆی دەزانێت چاوبخشێنێتەوە بە هەڵوێستیدا.»

چەند خاڵێکی تری جیاوازی بۆ سەرکردە شیعە و سوننەکان مەسەلەی چۆنێتی دابەشکردنی قازانجەکانی نەوتە و بەشداریی دەرەوەیە لە سیاسەت و گرێبەستە نەوتییەکانی عێراقدا. یاسای نەوتی عێراقی ناڕوون و تەمومژاوییە لەم مەسەلانەدا.

بەڵام کات نەماوە. کۆشکی سپی تادێت بێئومێدتر دەبێت لە بینینی نیشانەکانی پێشڕەوی سیاسی پێش ئەوەی سەرکردەی سەربازی ئەمریکی لە عێراق جەنەراڵ دەڤید پاتریۆس و باڵوێزی ئەو ئەمریکا لە عێراق رایان کرۆکەر هەفتەی داهاتوو راپۆرتەکەیان بدەنە واشنتۆن لەسەر ئەو پێشڕەویەی بەدەستهێنراوە لەو کاتەوەی ئەمریکا سەربازی زیاتری رەوانەی ئەو وڵاتە کردووە لە مانگی شوباتی رابردوودا. ئەگەر تا ئەو کاتە باشبوونێکی کەم لە بارودۆخەکەدا روویدات، کۆنگرێس و جەماوەری ئەمریکی پێدەچێت فشار بخەنە سەر ئیدارەی بوش بۆ کێشانەوەی ئەو ١٦٢ هەزار سەربازە لە عێراق.

کێشەکانی پرۆژەی یاسای نەوت ئاماژەیەکی خراپە بۆ ئەو «پێشڕەویانەی» تر کە ئیدارەکەی بوش فشاری خستۆتە سەر حکوومەتەکەی مالیکی بەدەستیانبهێنێت. وەك هەڵبژاردنی پارێزگاکان، پوچەڵکردنەوەی بڕیارێکی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان بۆ ڕێگرتن لە ئەندامانی حیزبی بەعسی پێشوو لەوەی پۆستی حکوومی و سەربازی بگرنە دەست و هەمووارکردنی دەستووری عێراقی. بەڵام ئەندام پەرلەمانانی عێراق ئاماژەیەکی کەمیان نیشانداوە کە ملدەدەن بۆ ڕازیکردنی بۆش سەبارەت بە مەسەلەیەکی هەستیاری وەکو نەوت.

مەحمود عوسمان کە ئەندام پەرلەمانێکی کوردی میانڕەوی ناسراوە لە بەغدا وتی «دوو کاتژمێرمان هەیە، کاتژمێری بەغدا و کاتژمێری واشنتۆن، ئەمەش نموونەیەکی دەقاودەق تەواوە و هەمیشە مەسەلەکە وابووە. واشنتۆن پاڵی بە عێراقییەکانەوە ناوە بۆ ئەوەی ئەو شتانە بکەن کە لەگەڵ ئەجێنداکەی خۆیدا بگونجێت».

چاوپێکەوتن تاکە چەکی سەرەکی دەستی ڕۆژنامەنووسە بۆ ئامادەکردنی ستۆرییەك، چونکە هەریەکە لە ئیقتیباسو زانیاری کە دوو بەشی گرنگی پێکهاتەی ستۆرین لە ڕێگەی چاوپێکەوتنەوە بەدەستدێت، کەواتە چاوپێکەوتنێکی سەرکەوتوو ئەگەری ستۆرییەکی سەرکەوتوو بەرجەستە دەکات. لێرەدا مەبەستمان لە چاوپێکەوتن چاوپێکەوتنی ئەو کاراکتەرانەیە کە پەیوەندیدارن بەو کێشە یان ڕوداوەی کە دەمانەوێت ستۆرییەکی لەسەر بنووسین. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەو تەکنیك و ئەتەکێتانەی لەم بەشەدا باسی دەکەین دەکرێت بۆ چاوپێکەوتنێکی تایبەت یاخود ستۆرییەکی تەحقیقیش بەکاریان بهێنین. کریستین گیلەر ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی دەڵێت «ئەنجامدانی چاوپێکەوتن بە شێوەیەکی بەهرەمەندانە بنەمای هەموو ڕوماڵکردن و نووسینێکی ڕۆژنامەوانی باشە».

بەڵام دەستکەوتنی دەرفەت بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن هەمیشە پرۆسەیەکی ئاسان نییە، چونکە زۆربەی خەڵکی پێیانخۆش نییە قسە بۆ ڕۆژنامەنووس بکەن، بە



تایبەتی لێپرسراو و کاربەدەستەکان. ڕۆژنامەنووس پێویستە پێشبینی هۆکارانە بکات کە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێك قورس و گران دەکەن ئەوانیش :

- کاربەدەستان کاتی پێویستیان نییە : بە زۆری بەرپرسان دەڵێن کاتمان نییە بۆ ئەو چاوپێکەوتنە یاخود زۆر سەرقاڵین، ڕۆژنامەنووس دەکرێت بە دیاریکردنی کاتی چاوپێکەوتنەکە و وادەیەك کە بە خواستی کاربەدەستەکە دابنرێت دەتوانێت کۆمەکی بکات بۆ تێپەڕاندنی ئەم بیانووە.

- دەترسن چونکە پێیانوایە لە ڕاپۆرتەکەدا بەشێوەیەکی خراپ پیشاندەدرێن: بەدگومانی هەندێ لە کاربەدەستان سەبارەت بەو هەستەی کە ڕەنگە لە ستۆرییەکەدا خراپ بخەملێنرێت دوودڵییان دەکات لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن، بەڵام مامەڵە کردنی ڕێزدارانەی ڕۆژنامەنووس لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا و دیاریکردن و ڕوونکردنەوە پێویستی ئەو بۆ قسە کردن لە ڕاپۆرتەکەدا جۆرێك لە دڵنیایی پێدەبەخشێت و ڕەنگە بتوانی قەناعەتی پێ بکەیت بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە.

- نازانن چی دەڵێن یان ناتوانن هیچ بڵێن : ئەمەش بیانوویەکی ترە کە زۆرجار ئەگەری ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکان لاواز دەکات، بەڵام دیاریکردنی ئاراستە و گۆشەی ستۆرییەکە و ڕوونکردنەوەی پێگە و پەیوەندی کەسەکە بە بابەتی ستۆرییەکەوە یاریدەی ڕەواندنەوەی ئەو گومانانە دەکات.

- زۆر سەختە پەیوەندییان پێوە بکرێت : ئەمە گەورەترین کێشەی ڕۆژنامەنووسانە بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی چاوپێکەوتن، چونکە ڕەنگە کاربەدەستەکە هیچ کێشەیەکی نەبێت بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن بەڵام کە ناتوانرێت داخوازی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکەی لێ بکرێت لە بنەڕەتدا بیرۆکەکە دەکوژێت، هەربۆیە ڕۆژنامەنووس پێویستە پەیوەندییەکانی خۆی زیاد بکات و بتوانێت هەموو هۆکارە یاساییو نەزیهەکان بگرێتە بەر بۆ پەیوەندی کردن بەو بەرپرسانەی گەرەکیەتی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجامبدات ئیدی لە ڕێگەی سکرتێرەکەیەوە بێت یان مۆبایل یان ئیمەیلو ئینتەرنێت و هەر هۆکارێکی دیکە.

## چاوپێکەوتن interview

هەموو چاوپێکەوتنێکی ڕەسمی formal interview پێویستی بە سێ قۆناغی تایبەتی هەیە (پێش چاوپێکەوتن — کاتی چاوپێکەوتن - دوای چاوپێکەوتن).

### قۆناغی یەکەم: پێش چاوپێکەوتن

• دوای وەرگرتنی کاتی چاوپێکەوتنەکە پێویستە ڕۆژنامەنووس خۆی ئامادە بکات و سەعی خۆی بکات لەو بابەتەی بە نیازە لە بارەیەوە چاوپێکەوتنەکە ساز بکات.

• بزانە ئەو کەسانە کێن کە لەوانەیە ئەو کەسە باسی بکات کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ساز دەکەیت. بۆ نموونە کاتێک چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری دەرامەتە سروشتییەکان دەکەیت دەبێت پێشتر بزانی حسێن شەهرستانی وەزیری نەوتی عێراقە چونکە دەشێت ئەو ناوە لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا زۆر دووبارە بێتەوە.

• چاوپێکەوتنی تر بخوێنەرەوە کە ڕۆژنامەنووسی دیکە لەگەڵ ئەو کەسەدا ئەنجامیداوە، چونکە ئەوە وێنەیەکی پێشترت لەسەر ئەو کەسایەتییە دەداتێ لەسەر ئاستی کارلێکو پەرچەکرداری کەسایەتییەکە بۆ ئەو پرسیارانەی ڕۆژنامەنووسەکە لێیکردووە، یاخود دەتوانرێت لە ڕێگەی ئەو چاوپێکەوتنەوە خوێندنەوەیەکی دەروونی بۆ کەسایەتییەکە بکەیت کە ئایا ئەو کەسە زوو تووڕە دەبێ یان خاوەنی ئەعسابێکی ساردو هێمنە.

• قسە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ڕۆژنامەنووست بکە کە پێشتر چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەو کەسە ئەنجامداوە، ئەوەش بە هەمان شێوەی خاڵی پێشوو بەرچاو ڕۆشنیت دەداتێ بۆ چۆنێتی ڕووبەڕوو بوونەوەی کەسایەتییەکە.

• پرسیارەکانت بنوسەرەوە، بەڵام ڕێبدە گفتوگۆکەتان بەرەو ئاڕاستەی تریش بڕوات، واتە پرسیارەکان تەنها وەك وێستگەیەك بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆیەکی فرە



ڕەهەند بەکاربهێنە. نووسینەوەی پرسیار پێش چاوپێکەوتن بە ئەندازەی نەخشەیەکە بۆ بە دەستهێنانی ئامانجە ڕۆژنامەوانییەکەت.

• بە هەموو شێوەیەك خۆت بە دوور بگرە لە پیشاندان یان ناردنی پرسیارەکانت بۆ کەسەکە پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە.

### قۆناغی دووەم: کاتی چاوپێکەوتن

• لە کاتی خۆیدا یان چارەکە سەعاتێك پێشتر لە شوێنی دیاریکراو ئامادە بە، چونکە دواکەوتن و دواتر پەلە کردن بۆ قەرەبووکردنەوەی کاتە لە دەستچووەکەت سەرباری ئەوەی ماندووت دەکات لەهەمانکاتیشدا تەرکیزت پەرت دەکات.

• ڕیکۆردەرو کامێراکەت بە تەواوی چێك بکە و دڵنیابە لە باش کارکردنیان.

• دەستبەجێ مەچۆرە ناو بابەتەکەوە، سەرەتا هەندێ قسەی ئاسایی لەگەڵ بەرپرسەکە بکە بۆ ئەوەی هەردووکتان بخاتە یەك ئاستەوە وەك مرۆڤ.

• یەکەمجار پرسیارە ئاسانەکانت بکە چونکە پرسیاری ئاسانو سادە متمانە لە نێوانتاندا دروست دەکات.

• لە کاتی خستنەڕووی پرسیارەکانتدا کەمێك ڕووی خۆشو موجامەلە بنوێنە.

• دووبارە بە بەرپرسەکە بڵێ لە چ دەزگایەکی ڕۆژنامەوانی کاردەکەیت و تەوەری چاوپێکەوتنەکەشت دەربارەی چییە.

• هەندێ وشە و زاراوەی بۆ ڕون بکەرەوە وەك وشەی on the record واتە وەك سەرچاوە ناوی دەبەیت.

• پێشتر مەسەلەی تەحریری بۆ ڕوون بکەرەوە، کە ڕەنگە لە لایەن ستافی تەحریری دەزگاکەتەوە چاوپێکەوتنەکە تەحریر بکرێت، ئەویش بۆ ئەوەیە ئەگەر بە هەر هۆیەك بەشێك لە چاوپێکەوتنەکە تەحریر کرا، توشی ئیحراج بوون نەبیت.

• بۆ هەر شتێك کە ویستی ناوی نەبرێت، ڕێك بکەوە لەگەڵیدا لەسەر شێوەیەك لە خستنەپاڵ، واتە بە چ سیغەیەك ئاماژەی پێدەکرێت.

• بەردەوام تەرکیزت لەسەر بابەتە سەرەکییەکەت بێت و وەڵامەکانی بەرامبەرت وێڵت نەکەن.

• تۆ لەو شوێنەی بۆ ئەوەی زانیاری بە دەست بهێنیت دەربارەی تەوەرەکانی چاوپێکەوتنەکەت یاخود چیرۆکەکەت، لەبەر ئەوە هەوڵبدە ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکەیت بەرەو ئیهتیمامەکانی خۆتی رابکێشیت نەك بەرەو ئیهتیمامەکانی ئەو بچیت.

• پرسیاری کورت و راستەوخۆ بکە و تەعلیقی خۆت تێکەڵ بە پرسیارەکانت مەکە.

• تۆ لەو شوێنەی بۆ ئەوەی بیرورای کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو بزانیت دەربارەی تەوەری گفتوگۆکەت، هەربۆیە کاتی ئەوە نییە رای خۆت دەربڕی بۆ کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵکراو.

• سەر دامەنوێنە بەرامبەر کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو، هەروەها فریویش مەخۆ بە هۆکاری (تەمەن، پلە و پایە و پۆست و رەگەز)، واتە لەبەر زۆری تەمەنی‌و رێزگرتنی کەسەکە شەرم مەکە لە ئاراستە کردنی پرسیارەکانت، هەروەها بەرزی پۆستی کەسەکەش نابێت ببێتە هۆی سڵکردنەوە لە ئاراستە کردنی هەر پرسیارێك، یاخود ئەگەر کەسەکە ئافرەت بوو نابێت کاریگەری بۆ سەر پرسیاری رۆژنامەنووسەکە هەبێت ئەگەر کوڕ بێت یان بە پێچەوانەوە.

• ئەگەر وەڵامێکی گرنگی دایتەوە زۆر توشی دڵخۆشی مەبە و خۆت دەرمەخە کە ئەو وەڵامە بەلاتەوە گرنگە، چونکە ئەگەر کەسەکە بزانێت ئەو وەڵامە جێی بایەخی تۆیە لەوانەیە بکەوێتە گومانەوە و بڵێت بڵاویمەکەرەوە.

• بە تەواوی گوێ لە وەڵامەکانی بگرە ئینجا پرسیارێکی دیکەی بخەرە بەردەم، بۆ ئەوەی زانیاری و ئیقتیباسی تەواوت دەربارەی ئەو پرسیارە دەستکەوێ.

• لە کاتی قسە کردنی ئەودا وەڵامی پرسیارە گرنگەکان و تێبینی و سەرنجەکانت تۆمار بکە.



• پرسیاری کراوە بکە و کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو بەرەو دەرەوە بهێنە، بۆ ئەوەی بتوانی زۆرترین ئەو زانیاریانەی لێبسەنیت، کە خۆت مەبەستە.

• زوو زوو ناوی کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو بهێنە، یاخود بە هەر سیغەیەکی تر کە شیاو بێت بۆ نموونە (جەنابی وەزیر)، هەروەها ببە بە ئاوێنە بۆ قسەکانی، واتە لە وەڵامەکانی کەسەکەوە پرسیاری دیکە دروستبکە.

• پرسیارە گرنگ و وروژێنەرەکان بخەرە دواوە، چونکە پرسیاری ئاسان لەسەرەتاوە متمانە دروست دەکات‌و ئەگەری بەردەوام بوونی چاوپێکەوتنەکە مسۆگەر دەکات، بەو پێیەی ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە پرسیارێکی وروژێنەر دەستمان پێکرد رەنگە کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو تورە بێت و راستەوخۆ کۆتایی بە چاوپێکەوتنەکە بێنێت.

• ئەگەر وەڵامی پرسیارێکت دەستنەکەوت یاخود نەیویست وەڵامی بداتەوە دەتوانیت بە سیغەیەکی تر و بە شێوازێکی دیکە هەمان پرسیار بکەیتەوە.

• لە کۆتاییدا پرسیاری لێبکە ئەگەر هەر شتێکی تری هەبێت حەز بکات بیڵێت، لێرەدا رەنگە هەندێ بابەت بورووژێنێت کە لەوانەیە کەس درکی پێنەکردبێت.

• داوای ژمارەی تەلەفونەکەی یان هەر هۆکارێکی پەیوەندی لێبکە نەوەك دواتر پێویست بەوە بکات بۆ هەندێ وەڵامی ناڕۆشن یان بۆ وەرگرتنی رونکردنەوە پەیوەندی پێوە بکەیت.

## قۆناغی سێهەم: دوای چاوپێکەوتن

مەبەست لە قۆناغی دوای چاوپێکەوتن ئەو کێشانەیە کە رووبەڕووی رۆژنامەنووس دەبێتەوە لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێکدا، واتە (problems in interviews). لەوانە:

• وەڵامی کورت و بێمانا.

هەندێ جار پرسیارێکی گرنگ لە کەسەکە دەکەیت بەڵام ئەو بە بەڵێ یاخود نەخێر وەڵامت ئەداتەوە، یان وەڵامێکی کورت و بێمانات ئەداتەوە کە هیچ

سوودێکی لێنابینرێت. لەم حاڵەتەدا باشترین چارەسەر ئەوەیە کە بە چاو پەیوەندی لەگەڵ کەسەکەدا بهێڵیتەوە و چاوەڕێی وەڵامی زیاتر بکەیت. هەروەك ئەو هەستی بێزاربوونەی نیشانیشی ئەدەیت زۆرجار وایان لێدەکات زیاتر قسە بکەن، یاخود پرسیارەکەت بە سیغەیەکی تر دووبارە بکەرەوە.

• وەڵامی دوور و درێژو بێ ناوەڕۆك.

هەندێ جار بە پێچەوانەوە کەسەکە وەڵامێکی دوور و درێژی بێ ناوەڕۆکت پێدەڵێت کە هیچ زانیارییەکی تێدا نییە و ناشتوانرێت لەو وەڵامە هیچ ئیقتیباسێکی لێوەربگیرێت، بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەو حاڵەتە باشترین شت ئەوەیە بە زمانی جەستە ئاماژەیەکی بدەیتێ کە قسەکانی جێی بایەخ نین، یاخود بە هەمان شێوەی پێشوو پرسیارەکەت بە شێوازێکی تر دووبارە بکەیتەوە لێی. ئەگەر هەر سوودی نەبوو هەوڵبدە بە ڕێزەوە پێی ببڕیت بۆ ئەوەی بیهێنیتەوە بەرەو لای مەبەستی پرسیارەکەت.

• فشارخستنە سەر رۆژنامەنووس بۆ ئەوەی دوای نووسینەوەی چاوپێکەوتنەکە جارێکی تر کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو بیبینێتەوە بۆ ئەوەی بە دڵی خۆی وەڵامەکان بگۆڕێت، تا ئەتوانی خۆت بە دوور بگرە لە گێڕانەوەی نوسخەی نووسراوی چاوپێکەوتنەکە بۆ کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو، چونکە ئەوە لەگەڵ بنەماکانی کاری رۆژنامەنووسی پیشەییدا تەبانییە.

**نموونەیەك :**

رۆبەرت سیگیلّ کە لە ئاژانسی رادیۆی نیشتمانی ئەمریکا کار دەکات ئەزموونی چاوپێکەوتنێکی خۆی دەگێڕێتەوە لەگەڵ دیبلۆماتکارێکی تورکیدا سەبارەت بە تەقەکردنی هاوڵاتییەکی تورکی لە پاپا یۆحەنا پۆڵسی دووەمو بریندارکردنی لە شاری رۆما ساڵی ١٩٨٢، رۆبەرت دەڵێت "یەکەم پرسیارم دەربارەی ئەو هاوڵاتییە تورکیە لێکرد کە ناوی محەمەد عەلی ئاغا بوو، پرسیارەکەشم ئەوەبوو کە ئایا چی دەربارەی ژیانی ئەو کابرایە دەزانێت؟ ئایا لە ئیتاڵیا لە کوێ ژیاوە؟ ئایا سەرقاڵی چی بووە لە



ئیتاڵیاو جۆری ئەو ڤیزایە چۆن بووە کە پێی دراوە بۆ چونە نێو ئیتاڵیا؟ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە یەك وشە بووە ئەویش (نەخێر یان نازانم)، هەربۆیە توشی بێ ئومێدی بووم چونکە پاش چەند هەوڵێکی ترو کردنی پرسیارەکان بە چەند شێوەیەکی تر هیچ زانیارییەکم دەست نەکەوت تاوەکو وام لێهات بێ هیوا بم لەوەی هیچ شتێکم دەست بکەوێت، ئیتر بە بێ دەنگی ماوەیەك وەستام، دواتر دیبلۆماتکارە تورکییەکە بێ دەنگییەکەی شکاند و وتی: ئەو کەسە تاوانبارێکی بە ناوبانگە لە تورکیا و دوای ئەوەی رۆژنامەنووسێکی ناوداری وڵاتەکەمانی کوشت دەستگیرکراو دواتر لە زیندان هەڵهات". رۆبەرت سیگیلّ باس لەوە دەکات کە هێندەی نەمابوو بە هۆی خراپی خستنەرووی پرسیارەکانییەوە چیرۆکێکی گەورەی لە دەست بچێت بۆیە بە بڕوای ئەو کردنی پرسیاری کراوە لەگەڵ ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجام دەدەیت کۆمەکییەکی زۆرت دەکات بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنەکە سەرکەوتوو بێت.

## کۆنگرەی رۆژنامەنووسی conference press

بریتییە لە رووداوێکی رۆژنامەوانی رێکخراو، کە تیایدا دامەزراوەیەك یان ئۆرگانێك یان کەسایەتییەك دەیەوێت بۆچون و زانیارییەکانی لە رێیەوە بگەیەنێتە رای گشتی مەبەستیش لێی گەیاندنی زانیاری و لێدوانە بۆ زۆرترین رۆژنامەنووس لە یەك کاتدا.

بە پێی سروشتی خۆی کۆنگرەی رۆژنامەنووسی تاکلایەنەیە و پرۆسەیەکی کۆنترۆڵکراوە، واتە یەك سەرچاوە قسەی تێدا دەکات و بۆچونێکی هاوسەنگ پێشکەش ناکات، هەربۆیە لە ریزبەندی سەرچاوەکاندا بە سەرچاوەی ناسەرەکی ئەژمار دەکرێت، لەبەرئەوە دەبێت رۆژنامەنووس بۆ تەواوکردنی زانیارییەکانی لایەنەکانی تری کێشەکە یان بابەتەکە بدوێنێت. کۆنگرەی رۆژنامەنووسی شوێنێك نییە بۆ خستنەڕووی رای رۆژنامەنووس و سەرنج و تێبینییەکانی یان پیشاندانی ئەوەی کە چەند ئازاو لێزانە لە رێی کردنی پرسیاری شکێنەرەوە بۆ قسەکەرەکە،

بەڵکو زۆر بە سانایی کۆنگرەی رۆژنامەوانی رووداوێکە کە رۆژنامەنووس دەتوانێت زانیاری تیا بە دەست بێنێت بۆ خوێنەرەکانی.

بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆر کۆنگرەی رۆژنامەنووسی هەیە :

- **کۆنگرەی رۆژنامەنووسی رەسمی formal press conference**

ئەو کۆنگرە رۆژنامەنووسیەیە کە پێشتر لە لایەن ئەو دەزگایەی کە سازیدەکات بڵاودەکرێتەوە یاخود ئیعلانی بۆ دەکات، تیایدا کات و شوێنەکەی دیاریدەکرێت و بە شێوەکی سەرەکیش زۆربەی جار بابەتی کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەش دەستنیشانکراوە یان ئاشکرا کراوە بۆ ئەوەی بزانرێت کۆنگرەکە دەربارەی چییە.

- **کۆنگرەی رۆژنامەنووسی نارەسمی informal press conference**

ئەو کۆنگرە رۆژنامەنووسییەیە کە گرووپێك رۆژنامەنووس دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەیەکی گرنگ یاخود رووداوێکی پڕ بایەخ بەرپرسێك دەوەستێنن کە بەشدارە لەو رووداوەدا یان پەیوەندی پێوەی هەیە و قایلی دەکەن یاخود هەندێ جار ناچاری دەکەن لێدوان بدات، بەرپرسەکە هیچ خۆ ئامادەکردنێکی پێشوەختی نەبووە بۆ مەسەلەکە.

### هەندێ تێبینی گرنگ لەسەرکۆنگرەی رۆژنامەوانی:

١. زوو بچۆرە شوێنی دیاریکراوی کۆنگرەکە و درەنگ بڕۆرەوە، چونکە لە زوو رۆشتندا هەم دەتوانیت شوێنێکی باش بۆ دانیشتن مسۆگەر بکەیت هەمیش دەتوانی پێش دەست پێکردنی کۆنگرە رۆژنامەوانییەکە لە رووی تەکنیکییەوە خۆت باش ئامادە بکەیت، ئەمە سەرباری ئەوەی لە درەنگ رۆیشتنەوەدا رەنگە زانیارییەکت دەستبکەوێت کە هاوڕێ رۆژنامەنووسەکانت دەستیان نەکەوێت.

٢. هەوڵبدە یاریدەدەرەکانی قسەکەرەکە بناسیت و کۆنتاکت و پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستیت، چونکە ئەگەری هەیە دواجار ببنە سەرچاوەیەکی خەبەری و زانیاری باش بۆت.



٣. لە شوێنێکدا دابنیشە کە بتوانیت قسەکەرەکە ببینیت و قسەکانیت بە جوانی گوێ لێبێت، هەڵبەت بۆ قسەکەرەکەش بە نیسبەت تۆوە بە هەمان شێوەیە.

٤. خۆت هیلاك مەکە بە نووسینەوەی شتە رەسمی و قسە دیبلۆماتییەکانەوە، بەڵکو گوێ بگرە بۆ زانیاری نوێ و ئیقتیباسی گرنگ.

٥. ئەگەر پێویستت بە ئیقتیباس هەبوو بیربکەرەوە لەوەی چۆن بەشێوەیەك پرسیارێك بکەیت کە وەڵامەکەی بۆ ئیقتیباس بشێت.

٦. ئەگەر شتێکت لەلا روون نەبوو، تێبینییەك لەلای خۆت بنووسە تاکو بتوانیت دواتر پرسیاری لەبارەوە بکەیت لە کاتی کردنەوەی دەرگای پرسیارکردندا.

٧. ئەگەر کاتی پرسیارکردن دەستیپێکرد، ئەوا دەستت بەرز بکەرەوە و هەوڵبدە بە خێرایی پرسیاری گرنگی خۆت بکەیت.

٨. گوێ بۆ پرسیاری هاوڕێ رۆژنامەنووسەکانت بگرە تاکو ئەو پرسیارانەی ئەوان کردوویانە تۆ دووبارەیان نەکەیتەوە.

٩. کاتێك سەرەی پرسیارکردنت گەیشت بە دەنگی بەرز ناوی خۆت و دەزگا رۆژنامەوانییەکەت ئاشکرا بکە بۆ قسەکەرەکە بە شێوەیەك کە بە روونی گوێی لێبێت.

١٠. یەك پرسیاری رون و پوخت بکە، تەنها یەك پرسیاری بە (دواداچوون) بکە، ئەگەر پرسیاری یەکەمت وەڵام نەدرایەوە، یان وەڵامەکەی روون نەبوو هیچ لیدوانێك مەدە.

١١. لە میانەی کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەدا، ئەگەر زانیت شتێکت لە کیس چووە یان پێویستت بە روونکردنەوەیە، ئەوا لە هاوڕێیەکی رۆژنامەوانت یان لە یاریدەدەری قسەکەرەکە بپرسە.

١٢. دڵنیابە لەوەی کە هەموو دۆکیۆمێنت و نووسراوێکت پێگەیشتووە کە لە کۆنگرەکەدا پێشکەش کراوە.

١٣. ئەگەر هەر پرسیارێکت مابوو ئەوا هەوڵبدە قسەکەرەکە بگریت لە کاتی ڕۆیشتندا، لەوانەیە لەو کاتەدا ئیقتیباسێکی تایبەت بە خۆتت دەستبکەوێت.

## ئیتیکی ڕۆژنامەنووسی

مەبەست لە ئیتیکی ڕۆژنامەنووسی ئەو پێوەرە ئەخلاقی و پیشەییانەیە کە کاری ڕۆژنامەنووسی سیستماتیزە دەکەنو چوارچێوەیەکی یاسایی و ئەخلاقی بۆ کاری ڕۆژنامەنووس دیاریدەکات تا ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو دوور لە قۆستنەوەو بەرجەستەکردنی بەرژەوەندی تایبەتی و خودی کارەکانی ئەنجامبدات.

هەرچەندە جیاوازی زۆر هەیە لە کاریی ڕۆژنامەنووسیدا بەڵام زۆرجار جیاوازییەکە لە بایەخپێدانە بە لایەنە جۆراوجۆرەکان نەوەك خودی سیستمی کارکردنەکە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ناوچە و وڵاتێك تایبەتمەندی ڕۆژنامەوانی خۆی هەیە، تەنانەت زۆرجار لەسەر ئاستی دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانیش دەگۆڕێت، بێگومان گۆڕانەکە ڕێژەییە، بۆ نموونە هۆشیاربوون لە بەرامبەر جیاکاریی و هاندانی توندوتیژی مەودایەکی فراوانی لە پێوەریی ڕۆژنامەنووسی ئەو وڵاتانەدا هەیە کە ململانێی ناوخۆیی تێدابووە وەکو وڵاتی بۆسنە.

یاخود وردبینی و بێلایەنی لە لوتکەی پێوەری ئەخلاقیو پیشەیی کاری ڕۆژنامەنووسی BBCیە کە پێویستە ڕۆژنامەوانەکانی پەیڕەوی لێبکەن. هەروەها یاسای کۆمەڵەی خاوەن ئیمتیازو سەرنوسەرانی یابان داوا لە ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنووسەکانیان دەکەن کە (بەردەوام هەوڵ بۆ ئایندەیەکی باش و پڕ ئاشتی بدەن) . یاخود بۆ نموونە کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانانی قیرگیستان سەرەتایەکی تا رادەیەك جوانیان هەیە بۆ پێوەری ئەخلاقی ڕۆژنامەوانی وڵاتەکەیان کە ئەویش ئەوەیە (ئەرکی ڕۆژنامەوان بریتییە لە خزمەتکردنی ڕاستیو ڕۆڵی ڕۆژنامەگەرییش بریتییە لە گەڕان بە دوای ڕاستیدا).

لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازیانەشدا هەڵبەت کاری ڕۆژنامەگەری کۆمەڵێك چوارچێوە و ستانداردی ئیتیکی نێودەوڵەتی هاوبەشی هەیە و بە شێوەیەکی گشتی



بنەمای کاری ڕۆژنامەنووسی جیهانیان لەسەر بەندەو جۆرێك لە ڕێکەوتنی نێودەوڵەتی لەسەرە، هەموو یاسا جیاوازەکانی ڕۆژنامەوانی وڵاتان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی بواری ڕۆژنامەگەری تەبان لەسەر چەند خەسڵەتێکی هاوبەش کە بە تاوانی ڕۆژنامەوانی ئەژمار کراوە، واتە ڕێکەوتنێکی گشتی و جیهانی هەیە لەسەر چوارچێوە نائەخلاقییەکانی کاری ڕۆژنامەوانی، لەوانە:

- هێرشکردن و ناوزڕاندن
- گزی کردن و دزیکردنی ئەدەبی
- خراپ گواستنەوەی ڕاستییەکان بە ئامانجی شەڕانگێزو توندوتیژی
- بەرتیل وەرگرتن بۆ شاردنەوەی ڕاستییەکان

جگە لەو چوارچێوە هاوبەشانەی کە ناشیاوی کاری ڕۆژنامەوانی جیادەکەنەوە لە کاری شایستەو شیاو، سێ بنەمای ئەخلاقی و پیشەیی هاوبەش و جیهانی هەیە لە کاری ڕۆژنامەوانیدا کە پێیان دەوترێت پێوەرە ئەخلاقی و پیشەییە هاوبەشەکان (common ethical and professional standards) ، کەواتە ڕۆژنامەوانان لە هەموو جیهاندا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕێکەوتوون لەسەر شێوازە شیاوەکەی ئەداکردنی کاری ڕۆژنامەوانی. ئەو سێ بنەمایەش بریتین لە:

- سەربەخۆیی یان بێلایەنی (الاستقلالیه او الحیادە) impartiality or independence
- وردکاریی (الدقه) accuracy
- پاکی (النزاهه) fairness

### یەکەم: سەربەخۆیی یان بێلایەنی impartiality or independence

هەموو یاسایەکی ڕۆژنامەوانی جەخت لەسەر (بێلایەنی) یان (سەربەخۆیی) دەکاتەوە، جەختکردنەوەکەش شێوەی جیاوازی هەیە و مەبەست لێی سەربەخۆیی ئابووری و سیاسی و بێلایەنی لەبەرامبەر بەرژەوەندی گرووپێکی تایبەت. بە واتایەکی دیکە ڕۆژنامەنووس

دەبێت لە ڕووماڵکردنی بابەتەکانیدا بێلایەن بێتو تەنها مەبەستی گواستنەوەی ڕاستییەکان بێت، هەڵبەت ڕێکەوتنێکی جیهانی هەیە بۆ بەرجەستەکردنی مانای بێلایەنی ئەویش ئەوەیە کە ڕۆژنامەنووس دەبێت هەمیشە دوور بێت لە دیاریکردنی بەرژەوەندی هەر لایەنێك لەو لایەنانەی پەیوەندیان بە کێشەکەوە هەیە، واتە ڕۆژنامەنووس نابێت پەیوەندی هەبێت بەو بابەتو کێشانەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

جۆن سمپسۆن سەرۆکی بەشی کاروباری نێودەوڵەتی لە دەزگای BBC کە لە ساڵی ١٩٦٦ەوە لەهەمان دەزگا کاردەکات، پێیوایە ڕۆژنامەنووس لە کاتی ڕووماڵکردنی هەر ڕوداوێك یان کێشەیەکدا دەبێت «هەمیشە لەدەرەوەی بابەتەکەی بێت».

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خاڵە تەواو ئاشکرایە کە بێلایەنیش هەرگیز لەسەدا سەد بەرجەستە ناکرێت بەڵام ڕۆژنامەنووس پێویستە تێبکۆشێت بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی نموونەیی.

## دووەم: وردەکاری accuracy

وردکاری یاخود دیقەت لە کاری ڕۆژنامەوانیدا تەنها پێوەرێکی ئەخلاقی و پیشەیی نییە بەڵکو ماکی هەموو کارێکی سەرکەوتووی ڕۆژنامەوانییە، هەموو کارێکی بەهێز و گرنگی ڕۆژنامەوانی وردکارییەکی سیستماتیزەکراوی لە پشتەوەیە. وردەکاریی واتە هەڵسەنگاندنو پشتڕاستکردنەوەی زانیارییەکان پێش بڵاوکردنەوەیان، بەڵام لەمەش زیاتر وردەکاریی کردن لە کاریی ڕۆژنامەنووسی واتا هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی هاوسەنگی و بالانس لە ژانرە ڕۆژنامەوانییەکاندا، ئەمە بە شێوەیەکی بنەڕەتی کارێکی زاتیو خۆییە لە لایەن ڕۆژنامەنووسەوە، بەڵام وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد ئەوە تەنها مەسەلەیەکی ئەخلاقی نییە، بەڵکو جۆرێك لە دەرەنجامی یاساییشی هەیە، بۆ نموونە هەندێ لە پسپۆڕانی بواری ڕۆژنامەگەری ئەمانەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سەرچاوەی هەواڵدا دەخاتە چوارچێوەی ئەم ستانداردەوە. هەروەها وردکاریی بە مانای ئەوەش دێت کە وتەو لێدوان و زانیارییەکان لە لایەن ڕۆژنامەنووسەوە بە وردیی وەك خۆی و بە تەواوی بڵاوبکرێتەوە.



## سێیەم: پاکی fairness

پاکی یاخود نەزاهەت لە کاری ڕۆژنامەنووسیدا جەوهەری پێوەرە ئەخلاقی و پیشەییەکانی کاری ڕۆژنامەنووسییە، چونکە ئەو زانیارییانەی ڕۆژنامەنووس بە خوێنەری دەڵێت تەنها خودی ڕۆژنامەنووسەکە ئاستی ڕاستبێژیان دەزانێ و ویژدانی پیشەیی ڕۆژنامەنووسەکە ڕۆڵ دەبینێ کە چی پێشکەشی خوێنەرەکەی دەکات ڕاستی یاخود شتی ناڕاست و هەڵبەستراو. پاکی واتە دروستنەکردنی زانیاری وەهمی و ئیقتیباسی وەهمی لەو ستۆریانەی بڵاویان دەکاتەوە، واتە بێئەوەی ڕۆژنامەنووسەکە خۆی ماندوو بکات ئیقتیباسی وەهمیو زانیاری وەهمی نەنووسێت. هەندێ لە پسپۆڕانی بواری ڕۆژنامەگەری، بەکارهێنانی ئەوەی پێی دەوترێت (کاری ئاسان) (essay work ) دەخەنە چوارچێوەی پێوەری نەزاهەت یاخود پاکییەوە، مەبەستیش لە essay work واتە کاتێك ڕۆژنامەنووس ئیقتیباسی کەسێکی پێویستە لە بری ئەوەی چاوپێکەوتنی هاوڵاتییەك بکات دێت چاوپێکەوتن لەگەڵ برایەکی یان باوکی یان هاوسەرەکەی یان کەسێکی نزیکی دەکات، خۆ ئاساییە ڕۆژنامەنووس ئیقتیباسی هاوسەرەکەی لە ستۆرییەکدا بەکاربهێنێت چونکە ئەویش دواجار هاوڵاتییەکە مافی قسەکردنی هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوە بۆ ڕۆژنامەنووس کارێکی ئاسانە پسپۆڕانی ڕۆژنامەگەری بە تێبینییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە کارانەدا دەکەن، هەربۆیە هەندێکیان بە جۆرێك لە ناپاکی لە کاری ڕۆژنامەنووسیدا لەقەڵەمی ئەدەن.

نەزاهەت دەبێت لەگەڵ ئەو کەسانەشدا پەیڕەو بکرێت کە ڕۆژنامەنووس چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجامدەدات، واتە بە ئەمانەتەوە و ئەو ئیقتیباس و لێدوانەکانی بگوازێتەوە بۆ خوێنەرەکانی، هەربۆیە ڕێنماییەکانی BBC ئاماژە بەوەدەکات کە ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجامدەدرێت مافی خۆیەتی بزانێت کە بابەتەکە دەربارەی چییە و چ جۆرە بەشدارییەك چاوەڕێکراوە لەو کەسە، هەروەك مافی خۆشیەتی بزانێت ئایا چاوپێکەوتنەکە ڕاستەوخۆیە یان تۆماردەکرێت، ئایا دواتر دەستکاری دەکرێت. بەڵام لە هەمانکاتیشدا ماف ئەداتە ڕۆژنامەنووسەکە

کـە بـۆی هەیـە گومـان لـەو شـتانە بکـات کـە پێیـدەگوترێت، واتـە مـافی ڕۆژنامەنووسەکەیە بگەڕێت بە دوای بابەتەکەدا بەڵام لەگەڵ ڕێزگرتنی بەرامبەرەکەی.

پاکی یاخود نەزاهەت لە کاری ڕۆژنامەنووسیدا شێوەی بە دەستهێنانی زانیـاریش دەگرێتەوە، بە واتایەکی دیکە پێویستە ڕۆژنامەنووس لە بەدەستهێنانی زانیاریەکاندا ڕێگای نەزیهانە بگرێتە بەر، بۆ نموونە یاسـای ئـەخلاقی کۆمەڵـەی ڕۆژنامەنووسـانی نێودەوڵەتی جەخت لەسەرئەوە دەکەنـەوە «ڕۆژنامـەنووس پێویـستە تـەنها شـێوازی نەزیهانە بەکاربهێنێت بۆ دەستکەوتنی هەواڵ و وێنەی فۆتۆگراف و دۆکیۆمێنت».

بەڵام دەبێت ئـەوەش بـزانین کـە نەزاهـەت وەکـو فیکـرە پـشت دەبەسـتێت بـە کەلتووریی وڵاتی ڕۆژنامەوانەکە، واتە ئەوەی لـەوڵاتێك بـە نەزاهـەت دادەنرێـت لـە وڵاتێکی دی بە نانەزیهی دادەنێن، هەڵبەت ئەوەش یاسا دەستنیـشانی دەکـات، بـۆ نموونە یاسای ڕۆژنامەوانی ئەڵمانی ڕێگە بە ڕۆژنامەنووس دەدات کە بۆ ئاشکراکردنی گەندەڵی و کاری خراپی بەرپرس و کەسانی زۆر گرنگ (V.I.P)ی کۆمەڵگە ڕێگـەی جاسوسی بەکاربهێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەزاهەت وەکو ستانداردێکی ئەخلاقیو پیشەیی کاری ڕۆژنامەنووسی نێودەوڵـەتی سـنووری کـەلتووری و ڕۆشـنبیری وڵاتـان دەبەزێنێت و جیاوازییەکە لە ئاستەکانی جێبەجێکردندایە نەوەك بیرۆکە گـشتییەکە، هەربۆیە کاری ڕۆژنامەگەری نەزیهانە بۆ بـە دەسـتهێنانی زانیـاریو فۆتـۆ جیـاوازە لەگەڵ شێوازی کارکردنی گرووپی پاپارازییەکان paparazzi (ئەو کەسانەی هـەموو ڕێگەیەك دەگرنەبەر بۆ بەدەستهێنانی فۆتۆ یان زانیاریەك لەسەر کەسە ناودارەکان بـە تایبەتی ئەستێرەکانی سینەما لە ڕۆژئاوا، کە بەردەوام بەشوێنیانەوەن تا وێنەیـەکیان بگرن یان زانیاری لەسەر بەشێکی ژیانیان دەسـتکەوێت، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش پـەنا دەبەنەبەر هەموو شێوازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان)، بەڵام ڕۆژنامەنووس پێویستە جیاواز لە شێوەی کارکردنی گرووپی پاپارازییـەکان کاربکـات و تـەنها میکـانیزم و شێوەی نەزیهانە بگرێتەبەر لە کارە ڕۆژنامەوانییەکانیدا.



دواجار پێویستە ڕۆژنامەنووس ئەوەی لە یاد بێت کـە ئـەوان هێزێکـی فـراوان و کاریگەریان هەیە لە کۆمەڵگەدا، دەبێت ئەوەشیان لە یاد بێت کە خراپ بەکارهێنانی ئەو هێزە بـە کـارێکی نائـەخلاقیی دادەنرێـت لـە کـاری ڕۆژنامەوانییـدا، ئەمـەش شێوەیەکی دیکەی مانادانەوەی پێوەری نەزاهەتە لە کاری ڕۆژنامەنووسیدا.

**تێبینی:**

زۆرێك لە پێوەرە ئەخلاقییەکانی کاری ڕۆژنامەنووسی جەخت لەسەر پابەنـدبوونی ڕۆژنامەنووس دەکەنەوە لە پارێزگاریکردنی سەرچـاوەکەی، واتـە پارێزگـاریکردن لـە سەرچاوەکان یەکێکە لەو سنوورانەی کە ڕۆژنامـەنووس پێویـستە بیپارێزێـت، بـەڵام ئەمە پابەندی سیستمی یاسایی ئەو وڵاتەیە کـە ڕۆژنامەنووسـەکە تێیـدا دەژی، بـە مانایەکی تر پارێزگاریکردن لە سەرچاوەکان نەریتێکی ڕۆژنامەوانییە بەڵام ئەوەش لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکـی تـر دەگـۆڕێ و یاسـای ڕۆژنامـەوانی وڵاتـان سیـستماتیکی دەکات، بۆ نموونە ئەنجوومەنی ڕێکەوتننامەی ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ بە تایبەتی هێما بۆ ئەم خاڵە ناکـات، بـەڵام بڕیـارێکی لیژنـەی بریکـاری وەزیرەکـانی یـەکێتی ئەوروپا داوا لە کارمەندە حکومییەکان دەکەن ناوی سەرچاوەی زانیارییەکانیان بڵێن ئەویش بەپێی ماددەی ١٠ لە یاسای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ کە تایبەتە بە مافی ئازادی بیروڕا. پسپۆڕانی ڕۆژنامەوانیش لە ئەنیستیتیۆی ڕۆژنامەوانی جەنگو ئاشتی پێیانوایە کە پارێزگاریکردن لە سەرچاوەکان ئەرکی ڕۆژنامەنووسـە، بـەڵام بـە بـڕوای ئەوان زەحمەتە بتوانرێت حاڵەتەکە وەکو پێوەرێکی نێودەوڵەتی دابنرێت.

### ڕاگەیاندنی یەکێتی ڕۆژنامەوانانی جیهانی دەربارەی ئیتیکی ڕۆژنامەوانان

بەدەر لەو سێ پێوەرە ئەخلاقی و پیشەییە هاوبەشەی کە پێـشتر ئاماژەمـان بـۆ کرد، یەکێتی ڕۆژنامەوانانی جیهانی وەکو ڕێکخراوێکی نێودەوڵـەتی ڕاگەیـەنراوێکی تایبەتی دەربارەی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی هەیە کە لە ٩ بڕگەی سەرەکی پێکهـاتووە و

وەکو ستانداردێکی نێودەوڵەتی ئیتیکی پیشەیی پشتی پێدەبەسترێت لە لایەن ئەوانەی وەك رۆژنامەنووس بەشداری دەکەن لە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوە و چاپکردنی هەواڵ و زانیاری و وەسفی رووداوەکان.

١. ڕێزگرتنی راستی و ڕێزگرتنی مافی جەماوەر لە زانینی راستیدا بە ئەرکی سەرەکی رۆژنامەنووسان دادەنرێت.

٢. لە پێناو ئەو ئامانجەدا رۆژنامەنووس پێویستە بەردەوام بەرگری بکات لە پرەنسیپی ئازادی و مافی لێکدانەوە و رەخنەگرتنی بابەتیانە لە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان بە ڕێگەی دروستو نەزیهانە.

٣. پێویستە رۆژنامەنووس راپۆرتەکانی پشت ئەستوور بە راستییەکان بنووسێت ئەو راستییانەی کە سەرچاوەکانیان ئاشکراو زانراون، هەروەك نابێت رۆژنامەنووس راستییەکان بشارێتەوە یان بەڵگەنامەکان ساختە بکات.

٤. پێویستە رۆژنامەنووس ڕێگەی پاك و نەزیهانە بەکاربهێنێت بۆ دەستکەوتنی هەواڵ و زانیاری و فۆتۆ و دۆکیۆمێنت.

٥. پێویستە رۆژنامەنووس هەوڵی تەواو بدات بۆ راستکردنەوەی ئەو زانیارییە هەڵانەی بڵاویدەکاتەوە و بەهۆی ناوردکارییەوە زەرەرو زیان بە کەسانی تر دەگەیەنێت.

٦. لەسەر رۆژنامەنووس پێویستە رەچاوی نهێنی کارەکەی بکات بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەو سەرچاوەی زانیارییانەوە هەیە کە داوا دەکات ناوی نەهێنرێت.

٧. پێویستە رۆژنامەنووس هۆشیار بێت بەو مەترسیانەی کە راگەیاندن و میدیا نەکرێتە هۆکارێك بۆ جیاکاری رەگەزیی و دەبێت بەوپەڕی توانایەوە هەوڵبدات کە دوور بکەوێتەوە لە جیاکاری لەسەر بنەمای نەتەوە، رەگەز، ئاراستەی رەگەزیی، زمان، ئایین، بیروڕای سیاسی، بنەڕەتی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و جیاکاری تری جگە لەوانەش.



٨. پێویستە رۆژنامەنووس ئەم شتانە بە سەرپێچی پیشەیی ترسناك بزانێت، دزیی ئەدەبی، خراپ لێکدانەوە بە مەبەستی رق و شەڕانگێزی، شت هەڵبەستن، ناوزڕاندنی نووسراو و زارەکی، تۆمەتی ناڕاست و بێبنەما، وەرگرتنی بەرتیل بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان بەرامبەر بڵاوکردنەوە یان بڵاونەکردنەوەی راپۆرت و زانیارییەکان.

٩. ئەوانەی کە ناوی رۆژنامەنووسیان بەسەردا دەبڕێت پێویستە ڕێز بگرن لەو بنەمایانەی کە ئاماژەیان بۆکراوە، ئەویش لە چوارچێوەی یاسای گشتی وڵاتەکەیان، هەروەك رۆژنامەنووس پێویستە دان بەو پێوەرانەدا بنێت کە هاوپیشەکانی لە کارەکانیاندا پەیڕەوی لێدەکەن و پەیوەندیدارن بە مەسەلەی پرۆفیشناڵی کاری رۆژنامەوانییەوە، تا ئاستی دوورخستنەوەی هەر جۆرە دەخالەتێك لە لایەن حکوومەتەکانەوە یان هەر لایەنێکی ترەوە.

## پاشکۆی یەکەم

## هۆشیاری ڕۆژنامەنووسی بۆ بەرپرسان

**بنەما سەرەکییەکان بۆ سەرکەوتن لە ڕووبەڕووبوونەوەی میدیادا:**

هەندێ تێبینی گشتی هەیە کە لێرەدا زیاتر تەرکیزیان دەخەینە سەر، واتە ئەگەر ئەو تێبینیانەشت فەرامۆش کرد کە لە چوارچێوەی ئەم پاشکۆیەدا باسدەکرێن، ئەوا زۆر گرنگە ئەم چەند خاڵە بەهەند بگریت بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەندروست مامەڵە لەگەڵ ڕۆژنامەنووس و میدیاکاندا بکەیت:

١. بابەتی چاوپێکەوتنەکەت بزانە: هیچ چاوپێکەوتنێك قەبووڵ مەکە هەتاوەکو نەزانێت بابەتی چاوپێکەوتنەکە چییە، هیچ کاتێك بە دەستی خاڵی ڕووبەڕووی ڕۆژنامەنووس مەبەرەوە، بزانە بۆچی ئەو ڕۆژنامەنووسە دەیەوێت چاوپێکەوتن لەگەڵ تۆ بکات. خۆت ئامادە بکە ئینجا وەڵامی ڕۆژنامەنووس بدەرەوە.

٢. پێویستە پەیامێکت هەبێت: هەر کاتێك بابەتی چاوپێکەوتنەکەت زانی ٣ بۆ ٥ خاڵی سەرەکی پەیوەندیدار بە بابەتەکە ئامادە بکە.

٣. چاوپێکەوتن، قسەخۆشیو گفتوگۆ نییە: ڕاگەیاندن کەناڵی گشتی تۆیە، قسە بۆ خەڵکی بکە نەك بۆ ڕۆژنامەنووسەکە، نەرم و نیان بەو بزانە کە چاوپێکەوتن کاری ڕۆژنامەنووسانە.

٤. شتێك نییە بە ناوی لێدوانی نهێنی، کە شایستەی بڵاوکردنەوە نەبێت: ئەگەر لێدوانەکان نەخرێنە پاڵ تۆ مانای وانییە ئیتر بە کارناهێنرێت بۆ نموونە لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەیەکدا، یاخود لەوانەیە بەکاربهێنرێت بۆ جەختکردنەوە لەسەر زانیارییەکی دیکە.



٥. ئاسانی وەڵامەکان: هیچ شتێك وەکو وەڵامی درێژ و ئاڵۆز چاوپێکەوتنەکان ناکوژێت، لەبەرئەوە ئەگەر ئەتەوێت پەیامەکەت بگات دڵنیابە لە ئاسانی وەڵامەکانت.

٦. کورتبڕ بە: خۆت ڕابهێنە لەسەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکان لە ماوەی ٢٠ چرکەدا، چونکە هەموو جارێ ڕۆژنامەنووس ٢٠ چرکەی سەرەتای بەلاوە گرنگە، ئەگەر باش بوو ئەوانی تر فەرامۆش دەکات.

٧. ڕاستی بڵێ: نە بەشێوەیەکی ناڕاست وەڵامی پرسیارەکان بدەرەوە نە خەملاندن بکە، بەڵکو ڕاستییەکان چۆنە بەو شێوەیە بیخەرەڕوو.

*** کاتێك ڕۆژنامەنووس پەیوەندیت پێوە دەکات:**

یەکەم شت بریتییە لەوەی کە ئایا تۆ ڕەزامەندیت لەسەر ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە یان نا، وەڵامدانەوەی ئەم چەند پرسیارە هاوکاریت ئەکات لەسەر بڕیاردانەکەت:

١. بابەتی چاوپێکەوتنەکە چییە؟

٢. ئایا تۆ کەسێکی گونجاویت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ئەو بابەتە؟

٣. لە چ بوارێکی ڕاگەیاندندا ئەو ڕۆژنامەنووسە کاردەکات، تەلەفیزیۆن، ڕۆژنامە... هتد؟

٤. ئایا شێوەی چاوپێکەوتنەکە چۆن دەبێت؟ ئایا بۆ هەواڵە یان لە نێو ڕاپۆرتێکدا بڵاو دەکرێتەوە؟ ئایا چاوپێکەوتنەکە تۆمار دەکرێت؟ ئەگەر بۆ تەلەفیزیۆن بوو ئایا ڕاستەوخۆ دەبێت یان نا؟

٥. ئایا چاوپێکەوتنەکە لە کوێ دەکرێت و چەند درێژە دەکێشێت؟

٦. ئایا وادەی کۆتایی پەیامنێرەکە کەیە بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە؟

رۆژنامەنووسەکان خۆیان دەتوانن وەڵامی زۆربەی ئەو پرسیارانە بدەنەوە، بەڵام ئەگەر بڕیارتدا چاوپێکەوتنەکە ئەنجام نەدەیت، ئەوا پەیوەندی بە رۆژنامەنووسەکەوە بکەو ئاگاداری وادەی کۆتایی کاتی چاوپێکەوتنەکە بەو پێشتر ئێی بڵێ کە ناتوانیت ئەو چاوپێکەوتنە ئەنجامبدەیت، چونکە ئەوە سروشتی کاری رۆژنامەنووسانە و بیرت نەچێت ئەوانیش وابەستەی فەرمانی سەرنووسەرەکانیانن. وادە کۆتایی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە لەوانەیە چەند هەفتەیەك بێت یان چەند خولەکێك، رێزی تۆ بۆ ئەو کاتە، کاریگەریەکی پۆزەتیڤی گەورەی دەبێت لەسەر گرەنتی پەیوەندییە ئیعلامییەکانت لە داهاتوودا.باسێکی گشتی خاڵە سەرەکییەکانی بابەتەکەت پێشکەش بکە: کاتێك بڕیارتدا چاوپێکەوتنەکە ئەنجامبدەیت ۳ بۆ ٥ خاڵ ئامادە بکە بۆ گەیاندنی پەیامەکەت بە شێوەیەکی کورت و خێرا کە لە ۲۰ چرکە تێنەپەڕێت، پاشان ئەم پرسیارانە لە خۆت بکە:

- بابەتی چاوپێکەوتنەکە چییە؟
- چ پەیوەندییەك لە نێوان تۆ و بابەتەکەدا هەیە؟
- رەهەندی مێژوویی بابەتەکە چییە؟

**بۆ نموونە:**

رۆژنامەنووس: ئایا جێگیریی پیشەیی لە دامەزراوەکەتدا هەیە؟

**وەڵام:**

- رستەی یەکەم: وەڵامی پرسیارەکەت بە شێوەیەکی کورت و راستەوخۆ بدەرەوە، «بەڵێ یان نەخێر».
- رستەی دووەم: پاڵپشتی وەڵامەکەت بکە بە (ئامارو زانیاری)، «ئامارەکان دەیسەلمێنن کە جێگیریی پیشەیی لە دامەزراوەکەماندا هەیە بە بەراورد لەگەڵ دامەزراوەکانی تردا».



- رستەی سێهەم: بگوازەرەوە بۆ پەیامەکەت، «ئێمە هەمیشە هەوڵدەدەین بۆ فەراهەم کردنی ئەو بارودۆخ و رێوشوێنانەی کە جێگیریی پیشەیی بۆ کارمەندەکان بەرجەستە دەکات».
- رستەی چوارەم: پەیامەکەت دەستنیشان بکە، «ئێمە باوەڕمان وایە کە هەستکردن بە جێگیریی پیشەیی هۆکارێکی بنەڕەتییە بۆ چاککردنی ئاستی کارمەندەکان».

**ئامادەکردنی هەندێ زانیاری دەربارەی باکگراوەندی بابەتەکە:**

- ئەم زانیارییانە زۆر گرنگن بۆ رۆژنامەنووسەکە بە تایبەتی ئەگەر بابەتەکە گوماناوی بوو، ئەو زانیارییانە هەریەکە لە پڕوپاگەندە ئیعلامیی و ئامارو باکگراوەندی مێژوویی دەگرێتەوە. چەرچڵ دەڵێت: «دروستکەری هەواڵ بیت باشترە لەوەی کە دواتر مامەڵە لەگەڵ ئەوەدا بکەیت کە روودەدات، واتە کاراکتەر بیت باشترە لە رەخنەگر».
- پێشبینی پرسیاری سەخت بکە و وەڵامەکانیشی ئامادە بکە.
- دە قورسترین پرسیار دابنێ کە پەیوەندیدار بێت بە بابەتی چاوپێکەوتنەکە و لەوانەیە رۆژنامەنووسەکە لێت بکات، پاشان بیر لە چۆنێتی گۆڕینی وەڵامەکان بکەرەوە لە وەڵامی پرسیارەکەوە بۆ پێشنیگا کردنی خاڵە سەرەکییەکان و پەیامەکەت.

**خۆت رابهێنە لەسەر بینینی رۆڵ :**

ئەگەر پێشتر پرسیارەکانت بە دەست گەیشت، کە ئەوە کارێکی باو نییە لە رۆژنامەنووسیدا ئەوا هەستە بە لێکۆڵینەوە لە پرسیارو وەڵامەکانی، هەروەها وەڵامەکان دووبارە بکەرەوە بۆ ئەوەی کۆنترۆڵیان بکەیت یاخود دەتوانیت تۆماریان

بکەیت یان بیاننووسیتەوە، بەڵام هەرگیز پشت بە خوێندنەوەیان مەبەستە لە کاتی چاوپێکوتنەکەدا.

ئاگادار بە :

زۆربەی چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانییەکان هەلێکن بۆ ئاشناکردنی خەڵکی سەبارەت بە شتە باشەکانی پیشەکەت یان دامەزراوەکەت، لەبەرئەوە نزیك بە لێیانەوە و متمانە بە خۆت بکە.

*** لە کاتی چاوپێکەوتندا:**

**پەیامی خۆت بگەیەنە :**

کە ئامادەی چاوپێکەوتنەکە بوویت پەیامی ئاشکرای خۆت لە ئەندێشەتدا ئامادە بکە، هەوڵبدە هەلێك بدۆزیتەوە بۆ گەیاندنی پەیامەکەت بەبێ ئەوەی پرسیارەکانی رۆژنامەنووسەکە فەرامۆش بکەیت، دەستپێشخەرییەکان با لە تۆوە بن چونکە تۆ شارەزایت و هەر خۆشت دەزانیت چی پێویستە کە خەڵکی بیزانێت.

**مامۆستا بە نەك وتەبێژ :**

چاوپێکەوتنە هەواڵئامێزەکان بریتین لە گۆڕینەوەی زانیاری، سەرچاوەی ئەو زانیارییە تۆیت و رۆژنامەنووسەکە گوزارشت لە خەڵکی گشتی دەکات، وا هەست مەکە پێویستە رەچاوی ئەو ئادابە کۆمەڵایەتییانە بکەیت کە تەحەکوم بە شێوازی گفتوگۆوە دەکات.

**کورتبا بە :**

رۆژنامەنووسان هەمیشە بێزارن لە وەڵامی دوور و درێژ و ماندووکەر، ئەوان ئەو وەڵامە کورت و گرنگانەیان دەوێت کە لە سێ دێڕ پێکهاتوون یاخود ئەگەر چاوپێکەوتنەکە تەلەفیزیۆنی بوو ٢٠ خولەکی سەرەتایان دەوێت، لەبەرئەوە ئەو ٢٠ خولەکە بەکاربێنە بۆ خستنەڕووی پەیامەکەت. زانیاری پێشتر لەسەر ئەو وتانەی



دەیانڵێیت زۆر هاوکاریت دەکات لە ئاسانی وەڵامدانەوەکەت، بشزانە ٤٥ خولەك ئاستی باڵای ئەو ماوەیەیە کە ئیقتیباسی دەنگی تیا دەردەهێنرێت لە چاوپێکەوتنی تەلەفیزیۆنیدا، مەگەر رۆژنامەنووسەکە روونکردنەوەی زیاتر داوا بکات، لەو حاڵەتەدا رەنگە ٩٠ خولەکت بداتێ.

**رۆڵت وەك وتەبێژ :**

لە کاتی سازکردنی چاوپێکەوتنێکدا رۆژنامەنووسان و جەماوەریش بە گشتی جیاوازی ناکەن لە نێوان هەڵوێست و بیروبۆچوونە تایبەتەکانی خۆت و دامەزراوەکەت، لەبەر ئەوە پێویستە بە شێوەیەکی گونجاو وەڵامی پرسیارەکان بدەیتەوە، چونکە دواجار تۆ وتەبێژی بە ناوی دامەزراوەکەتەوە نەك بە ناوی خۆتەوە، ئەگەر هەڵوێستی دامەزراوەکەشت لە بابەتێکدا نەدەزانی هەوڵبدە بە وردی بیزانیو خۆت دوور بخەرەوە لە خەملاندن.

**هەڵە مەکە و زمانێکی روون و ئاسان بەکاربهێنە :**

هەرگیز ئەو چەمك و ناوە کورتکراوانە بەکارمەهێنە کە پێویستیان بە روونکردنەوەو پەراوێز هەیە. هەروەها دوور بکەوەرەوە لەو زمانە بیرۆقراتیەتەی کە تێگەیشتن لە بابەتەکە ئاڵۆز دەکات. واتە بە شێوەیەك بدوێ کە هەموو کەس تێبگات.

**راستی بڵێ :**

راستی تاڵە، بەڵام درۆ کوشندەیە، لە کۆتاییدا هەموو شتێك هەر ئاشکرا دەبێت، رۆژنامەنووسان هەرگیز ئەوانەیان لە یاد ناچێتەوە کە درۆیان لەگەڵ کردون و توشی کێشەی کردوون، راستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکە بدەرەوە، ئەگەر وەڵامەکەشت بە «نەخێر» یان «نازانم» یان «ببورە» یاخود « ناتوانم وەڵام بدەمەوە»، لەم حاڵەتەدا وەك پیاوێکی راستگۆ تەماشا دەکرێیت.

**ئارام بە :**

ئەو رۆژنامەنووسانەی چاوپێکەوتنت لەگەڵ دەکەن زاناو دکتۆر نین، لەبەرئەوە پێویست دەکات لەسەرەتای شتەکانەوە لەگەڵیاندا دەست پێبکەیت، بۆ ئەوەی تێبگەن. بشزانە چاوپێکەوتن تەحقیقی پۆلیس نییە، لەبەرئەوە هەوڵبدە پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ رۆژنامەنووسەکەدا دروستبکەیت.

**توورە مەبە:**

هەندێ لە رۆژنامەنووسان بەمەبەست دەتووروژێنن بۆ ئەوەی پەرچەکردار بنوێنیت، لەبەر ئەوە ئاگاداری ئەو تەڵەیە بە و بەرێزەوە وەڵام بدەرەوە و خۆت بالادەست نیشانبدە، چونکە لەوانەیە توڕەبوونەکەت باس بکرێ بە بێ ئاماژە کردن بە هۆکارەکانی.

**وەڵامی پرسیار بە پرسیارێکی دیکە مەدەرەوە:**

ئەگەر رۆژنامەنووسەکە پرسیارێکی لێکردی «رات چییە لەسەر شەفافییەت؟» لە وەڵامدانەوەکەتدا مەڵێ «مەبەستت چییە لە شەفافیەت؟»، یاخود مەڵێ «ئەی رای تۆ چییە لەسەر شەفافیەت؟»، ئەم جۆرە وەڵامانە هەستی ئەوە لای رۆژنامەنووسەکە دروستدەکات کە تۆ پێچە بەدەورە یاخود کارێکی شەڕانگێزی لەگەڵ دەکەیت.

**لێدوان نادەم:**

لە وەڵامی پرسیارەکانتدا مەڵێ «لێدوان نادەم»، یاخود مەڵێ «ناتوانم جەختی لەسەر بکەمەوە یان نەفی بکەم»، چونکە جەماوەر لەو وەڵامەوە تێدەگات کە تۆ وەڵامی پرسیارەکە دەزانی، بەڵام خۆت ناتەوێت ئاشکرای بکەیت، ئەگەر حاڵەتێکی لەو شێوەیە هاتە پێشەوە دەکرێت بە رۆژنامەنووسەکە بڵێیت کە ناتوانیت سەبارەت بەو پرسیارە لێدوان بدەیتو ئاماژە بە هۆکارەکەشی بکەیت، بۆ نموونە رەنگە



پرسیارت دەربارەی پرۆژەیەك لێبکرێت کە جارێ تەنها لە قۆناغی رەشنووسی سەرەتاییدایە، لەم حاڵەتەدا بڵێ پرۆژەکە لە سەرەتاکانیدایە و هێشتا بە تەواوی بڕیاری لە بارەوە نەدراوە، دەکرێت ئەوەشی پێ بڵێیت کە هەر بڕیاری لەسەر درا وردەکارییەکانی پێ بڵێیت.

**وەڵامێك پێشکەش مەکە کە نەدەبوایە بتوتایە:**

وەڵامی پرسیارێك مەدەرەوە ئەگەر لە پسپۆڕی و دەسەڵاتی تۆدا نەبوو یا وەڵامەکەشی بزانیت، هەربۆیە کارێکی ئاساییە ئەگەر بۆ وەڵامی پرسیارێك رۆژنامەنووسەکە بێریتە لای بەرپرسێکی تر یاخود بەشێکی تر لە هەمان دامەزراوەی خۆتدا، ئەگەر رۆژنامەنووسەکەش سوور بوو لەسەر ئەوەی وەڵامەکە لە تۆ وەربگرێت خۆت تێکمەدەو لەسەر هەڵوێستی خۆت بمێنەرەوە، هەر مەڵێ نێوانی خۆمان بێت یان بە خەملاندن قسە بکەیت.

**لە روانگەی دیدگای خەڵکەوە قسە بکە:**

لە یادت نەچێت تۆ لە رێگەی رۆژنامەنووسەکەوە بۆ خەڵکی قسە دەکەیت، لە خۆت بپرسە چۆن دەتوانی وتەکانت کاریگەری لەسەر خەڵك هەبێت؟ لەبەر ئەوە پێویستە وەڵامەکانت بە شێوەیەك بدەیتەوە کە جێگەی بایەخی خەڵکی بێت.

**پشت ببەستە بە زانیاری و ئامار:**

رۆژنامەنووسان ئەو راستیانەیان پێخۆشە کە بە ئامارو ژمارە پشتڕاستکرابێتەوە، هەربۆیە ئاوێتەکردنی وەڵامەکانت بە زانیاری و ئامار زیاتر بەهێزیان دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زیادەڕۆیی مەکە بەشێوەیەك گەورەتر لە حەقیقەتی بابەتەکان قسە بکەیت.

**خۆت ئامادە بکە بۆ دووبارە کردنەوەی پەیامەکەت:**

لەوانەیە هەندێ جار ڕۆژنامەنووسەکە زیاد لە جارێك بە دارِشتنەوەی جیاواز یەك پرسیارت لێ بکاتەوە، ئەویش لەبەر درێژی یان ئاڵۆزی وەڵامەکەی پێشوت بووە، یاخود تێینەگەیشتووە یان دەیەوێت وەڵامێکی قوڵتری دەستکەوێت، لەبەرئەوە ئەو حاڵەتە بەلاتەوە ئاسایی بێتو وای دابنێ هەلێکی دیکەیە بۆ دووبارە کردنەوەی پەیامەکەت.

**متمانە دروستبکە:**

شارەزاو پسپۆڕی کێشەکان تۆیت هەر تۆشی کە دەخوازیت پەیامەکەت بگەیەنیت، بەڵام بزانە هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان پلەوپایەکەت لەوەیە کەمێك دوودڵیان بکات لە کردنی هەندێ پرسیار، لەبەرئەوە هەوڵبدە لەگەڵیاندا نەرم و نیان بیت تا بتوانن وەك دوو مرۆڤ گفتوگۆ بکەن.

**ڕێزی وادە و کاتی ڕۆژنامەنووسان بگرە :**

پێویستە بە وردی کات و وادەی چاوپێکەوتنەکە بزانی و ئەگەر هەر کارێکت بۆ دروستبوو بۆت نەکرا لە کاتی دیاریکراودا چاوپێکەوتنەکە ئەنجامبدەیت پەیوەندی بە ڕۆژنامەنووسەکەوە بکە هۆکاری دواکەوتنەکەی بۆ ڕوون بکەرەوە. ئەمە نەك هەر گوزارشتە لە ڕێزی تۆ، کاری ڕۆژنامەنووسەکە، بەڵکو هۆکارێکیشە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی ئیعلامی باش لەگەڵ ڕۆژنامەنووساندا.

**لە دۆخی بەرگرییدا مەبە:**

با لێدوانەکانت تەعبیر لە گۆشەنیگا ڕاستەقینەکانت بکاتو تەنها بریتی نەبێت لە نەفیکردنو ڕەتکردنەوەی قسەو لێدوانی دیکەی لایەنەکانی تر، پەیامی ئاشکرای خۆت ڕوون بکەرەوەو واز لە کەسانی تر بێنە چی دەڵێن.



**دوور بکەوەرەوە لە خوێندنەوەی وەڵامی ئامادەکراو:**

نووسینەوەی وەڵام و خوێندنەوەی لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا هێمایەکی خراپە و شارەزاییو توانستت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان ئەخاتە ژێرپرسیارەوە، بەتایبەتی لە چاوپێکەوتنی تەلەفیزیۆنیدا.

**هەرگیز داوا مەکە پێش بڵاوکردنەوە، نووسراوی چاوپێکەوتنەکە ببینی:**

بە گشتی ڕۆژنامەنووسان بەوە ڕازی نابن کە پێش بڵاوکردنەوە، دەقی نووسراوی چاوپێکەوتنەکە یان ڕاپۆرتەکە پیشانی هیچ کەسێك بدەن، تەنانەت ئەو بەشەش کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەتۆوە هەیە یان لێدوانی تۆی تێدا بەکارهاتووە، ئەمەش پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ڕۆژنامەنووسان وا هەست ئەکەن ئەگەر نووسراوەکەیان پیشانی کەسانی تر بدەن پێش بڵاوکردنەوە لەوانەیە دەستی تێوەر بدەن و هێڵە گشتییەکانی بابەتەکە بە لایەکی تردا بەرن، ئەوەش بۆ ڕۆژنامەنووسان جۆرێکە لە ئیهانەی پیشەیی.

### * پاش چاوپێکەوتن:

**بێ ئومێدبوون:**

لەوانەیە چەند کاتژمێرێك لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێکدا ببەیتە سەر، بەڵام دوای ئەوەی بڵاودەکرێتەوە تەماشا دەکەیت، یەك یان دوو ئیقتیباست بەکارهێنراوە، یان چەند خولەکێك لە نێو هەواڵەکاندا دەربکەویت، یان هەندێ جار ڕەنگە بابەتەکە هەر دانەبەزێت و بڵاونەکرێتەوە، لەو کاتانەدا تووشی بێ ئومێدی مەبە، چونکە مەسەلەی تەحریر کارێکی بێ مەبەستو لە دەرەوەی ئیرادەی ڕۆژنامەنووساندایە، هەربۆیە خودی پەیوەندیی بەستنی تۆو ڕۆژنامەنووسەکە وەك دەستکەوتێك تەماشا بکە.

**ناونیشانی ڕاپۆرتەکە یان چاوپێکەوتنەکە:**

ڕەنگە ڕاپۆرتەکە یاخود چاوپێکەوتنەکە بە شێوازێکی هاوسەنگ و بابەتییانە داڕێژرابێتەوە، بەڵام ناونیشانەکەی ناونیشانێکی سەرنجڕاکێش و وروژێنەر بێت، لە یادت بێت ناونیشان دانان پەیوەندی بە پەیامنێرەکانەوە نییە و لە کار و پسپۆڕی موحەریرەکانە، کە بەردەوام لە ژێر فشاردان لەبەر کەمی کات و ڕووبەری لاپەڕەکان، هەربۆیە ناچارن بە شێوەیەك بابەتەکە دابنێن کە لەگەڵ ستراتیژی دەزگاکەی و لایەنەکانی تردا بیگونجێنێت.

**سوپاسنامە:**

ئەگەر داڕشتنەوەی ڕاپۆرتەکە یاخود چاوپێکەوتنەکە بەو شێوەیە بوو کە خۆت پێتخۆش بوو، ئەوا پەیوەندی بە ڕۆژنامەنووسەکەوە بکەو دەستخۆشی لێبکە بەڵام با دەستخۆشییەکەت نەچێتە شێوەی ستایشەوە بۆئەوەی ڕۆژنامەنووسەکە وا هەست نەکات کە لە ڕاپۆرتەکەدا باڵانسی بەکارنەهێناوە.

**ڕەخنەگرتن:**

هەمیشە جیاوازی لە گۆشەنیگاکاندا هەیە و زۆرجار ستراتیژی ئیعلامی دامەزراوەیەك ڕۆڵی هەیە لە شێوازی داڕشتنەوەی بابەتەکاندا، لەبەر ئەوە ئەگەر ڕاپۆرتەکە یان چاوپێکەوتنەکە بەو شێوەیە نەبوو کە خۆت ئەتویست پێویست ناکات بیکەیت بە کێشە و گەورەی بکەیت، خۆ ئەگەر هەندێ هەڵەو دەستکاریکردن ڕوویدابوو دەتوانی ڕۆژنامەنووسەکە ئاگادار بکەیتەوە و دواتر ڕوونکردنەوەیەکی کورت بنووسیت بۆ ئەو ڕۆژنامەیەی کە بابەتەکەی بڵاوکردووەتەوە.

**مافە سەرەکییەکانی کەسی چاوپێکەوتن لەگەڵ کراو:**

- ئەو ڕۆژنامەنووسە کێیە کە چاوپێکەوتنەکەت لەگەڵدا ئەنجام ئەدات و نوێنەرایەتی چ ڕۆژنامە یان تەلەفیزیۆن یان هەر دامەزراوەیەکی ڕاگەیاندن دەکات.



- بەڕێزەوە مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت، تەنانەت ئەگەر وەڵامی پرسیارەکانیش سەخت بوون، نابێت ڕۆژنامەنووسەکە بە هەستێکی ناشایستەوە مامەڵەت لەگەڵ بکات.
- شوێنی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە ئارام بێت و سەرجەم پێداویستی چاوپێکەوتنەکە ئامادە بکرێت.
- ئامادەکردنی کەسی سێیەم لەگەڵ خۆتدا، وەکو شایەتحاڵێك. وا چاکترە پێشتر ڕۆژنامەنووسەکە لەو کارە ئاگادار بکەیتەوە چونکە زۆربەیان بەوە ڕازی نابن.
- سەلامەتی شوێنی کارەکەت پارێزراو بێت بە تایبەتی لەو کەلوپەل و ئامێرانەی کە ڕۆژنامەنووسەکە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت.
- لەگەڕەوەی وەڵامی پرسیارەکان دەتوانی ئەو پەیامەی دەتەوێت بگەیەنیت، بیخەیتەڕوو.
- ئەو ئیقتیباسانەی لێت وەردەگیرێت پێویستە بە شێوەیەکی ورد مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.
- زانیارییە تایبەتەکانت دەبێت پارێزراو بێت بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندی بە سروشتی کارمەندەکان و دامەزراوەکەتەوە هەیە.
- پێشتر شوێن و کاتی چاوپێکەوتنەکە بزانیت.
- دەتوانی کۆتایی بە چاوپێکەوتنەکە بهێنیت هەر کاتێك زانیت ڕۆژنامەنووسەکە ئیهانە بە کەسێتو پۆستەکەت دەکات.

## پاشكۆی دووەم

## هەندێ لەو ستۆرییانەی كە لە IWPR بڵاوكراونەتەوە

### دۆكیۆمێنتكردنی خراپەكارییەكانی بەعس

**گرووپێك كە ئەیەوێت دۆكیۆمینتی خراپەكارییەكانی ڕابردوو بكات، بەنیازە ئیشەكەی بەرەو ناوچە كوردنشینەكان فراوانبكات**

فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی

ڕێكخراوێكی عیراقی تەرخان بۆ دۆكیۆمێنتكردنی كوشتنوبڕینی ڕژێمی سەدام ئەیەوێت ئیشەكانی فراوانبكات بۆ سنووری كوردستانی عیراق، ئەو ناوچەیەی كە زۆری ئازار و ئەشكەنجەی چەشت لە سایەی سەدام حسەینی سەرۆكی پێشوودا.

دامەزراوەی یادەوەری عیراقی، كە بارەگاكەی لە واشینتۆن و بەغدایە، تۆڕێكی دروستكردووە بۆ دۆكیۆمێنتكردنی بەڵگەی زارەكی و نووسراو سەبارەت بە سیستەمی سەدام بۆ سەركوتكردن و كۆنترۆڵی كۆمەڵایەتی. لە كاتی دامەزرانییەوە لە ٢٠٠٣دا، زیاتر لە ١١ ملیۆن لاپەڕە بەڵگەی كۆكردۆتەوە بە مەبەستی تۆماركردنی ڕابردووی ئەزیەتدراوی عیراق بۆ ئەوەی نەوەكانی ئایندە وانە لە مێژوو وەربگرن.

پاش كۆنفرانسێكی ٤ ڕۆژی لە سلێمانی لە ٥/٥ ەوە بۆ ٢٠٠٨/٥/٨، ئەندامانی ئەو دامەزراوەیە ڕایانگەیاند بیر لە كردنەوەی ئۆفیسێك دەكەنەوە لەم شارە كوردییەدا.

كۆنفرانسەكە ٦٠ ڕیكخراوی ناحكوومی لە خۆگرتبوو لە سەرتاسەری عیراقەوە هەروەها شارەزایانی مەیدانی لە بۆرما و كەمبۆدیا و گواتیمالا و ئەمریكا و سربیاوە بانگهێشت كرابوون بۆ گفتوگۆ كردن دەربارەی گرنگی دۆكیۆمێنتكردنی یادەوەرییەكانی كوشتنوبڕین و میتۆدۆلۆجی پراكتیكی.



حەسەن مونەییمی بەڕێوەبەری دۆكیۆمێنتكردن لە دامەزراوەی یادەوەری عیراقی، وتی: «حوكمی ٣٥ساڵەی سەدام سەردەمی ستەمكاری بوو». هەروەها وتیشی:» یەكێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی ڕێكخراوەكە ئەوەیە بەڵگەنامە و كارە هونەری و ئەدەبییەكانی سەردەمی سەدام كە تەعبیر لە ئازارەكانی ئەو كاتە دەكات، بخاتە مۆزەخانەیەكەوە.

مونەییم ئاماژەی بەوەشكرد كە كۆنفرانسەكە لە سلێمانی سازكرا لەبەرئەوەی سەلامەتترین پارێزگای عیراقە و سەرباری ئەوەش ئازار و ئەشكەنجەی زۆری چەشتووە لە سایەی ڕژێمی بەعسدا، چونكە سەدان هەزار كورد كوژران و ئاوارەكران و بێسەروشوێنكران لە هەڵمەتەكەی سەدامدا لە دژی كوردەكان، كە ناوی ئەنفالی لێنابوو.

لە لایەكی دیكەوە قەهێل عەبدولڕەحمان، بەڕێوەبەری كاری مەیدانی دامەزراوەكە، وتی: «ئێمە هەڵدەسین بە دۆكیۆمێنتكردن بۆ ئیدانەكردنی كوشتنوبڕینەكانی ڕابردوو، بۆ ئەوەی دووبارەنەبنەوە».

گرووپە ناحكومییە عیراقییەكان كە ئامادەی كۆنفرانسەكە بوون ڕازیبوون لەسەر دروستكردنی تۆڕێك بۆ باشتركردنی پەیوەندی لەنێوان هەموو ئەو ڕێكخراوانەدا كە ئیش بۆ دۆكیۆمێنتكردنی ئەو تاوانانە دەكەن كە لە نێوان ساڵانی ١٩٦٨ و ٢٠٠٣ دا ڕوویانداوە.

ئەو كۆنفرانسە لە كاتێكدایە كە سەدام و پێنج لە دارودەستەكەی ئێستا لە پرۆسەی دادگاییكردندان لەسەر تاوان لە دژی مرۆڤایەتی و كوشتنی ١٤٨ كەس لە شاری دوجەیل لە ساڵی ١٩٨٢دا. قەهێل وتی:» ئەو دامەزراوەیە چەند بەڵگەنامەیەكی بۆ ئەو دادگا تایبەتییە عیراقییە دابینكردووە كە دادگایی قەزیەكە دەكات».

ڕزگار ئەمین كە پێشتر دادوەری ئەو دادگایە بوو، وتی : «ئەكرێت ئەو بەڵگەنامانە وەكو بەڵگە قبوڵبكرێن ئەگەر ڕاستی و دروستیان تەسدیق بكرێت».

هەروها ستایشی کۆنفرانسەکەی کردو لەوبارەیەوە وتی:«پردێکی بەیەکگەیشتنە بۆ ڕێکخراوە عیراقی و نێودەوڵەتییەکان بۆ یەکخستنی تواناکانیان بۆ دۆکیۆمێنتکردنی تراژیدیاکانی عیراق».

زۆرێك لە بەشداربووان کە لە سەرتاسەری عیراقەوە هاتبوون، یان چالاککاری بواری مافەکانی مرۆڤ بوون یان قوربانیانی ڕژێمی پێشوو بوون. هەندێك لە بەشداربووان ئەو خاڵەیان درووژاند کە کۆدەنگییەکی گشتی لەسەر ئەوە نییە کە سەردەمانی بەعس هێند خراپ بوویێت.

کەریمە حەسەن کە یەکێك بوو لە بەشداربووان، وتی:«بەداخەوە تا ئێستاش هەندێك لە عیراقییەکان و خەڵکانی دەرەوە باوەڕ بە دڕندەیی سەدام حسەین ناکەن».

لە ٢٨ نیساندا کە دەکاتە ساڵیادی شەست و نۆیەمینی لە دایك بوونی سەدام حسەین، دەڵێن هەندێك لە دانیشتوانی گەڕەکی ئەعزەمییەی شاری بەغدا کۆبوونەتەوە بۆ ئاهەنگ گێڕان بەو بۆنەیەوە و پۆستەری «دیکتاتۆر»ی پێشوویان ماچکردووە.

مەهدی تەمیمی سکرتێری گشتی کۆمەڵەی زیندانە سیاسییەکانی عیراق کە بارەگاکەی لە بەغدایە وتی:«هەندێك دەیانەوێت ڕژێمی عیراقی بگەڕێتەوە سەر حوکم بە هۆی ئەو قەیرانەوە کە ئێستا عیراقی پێدا تێدەپەڕێت»، هەروەها وتیشی:«مەبەست لە دۆکیۆمێنتکردنی سەردەمی سەدام دڵنیاکردنەوەیە لەوەی کە شتی وا دووبارە نابێتەوە». مەهدی ئەوەشی وت کە ئەیانەوێت منداڵەکانیان بە خۆشەویستی و لێبوردەییەوە پەروەردە بکەن.



**کوردستان «پەرلەمانی لاوان» دادەنێت:**

**پلانەکە بۆ دروستکردنی کەناڵێکی نوێیە بۆ لاوانی کورد بۆ دەربڕینی نیگەرانییەکانیان، بەڵام ئایا لە لایەن حزبە سیاسییەکانەوە پێشگیری دەکرێت؟**

**فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی و هەولێر**

گرووپەکانی لاوانی کوردستان «پەرلەمان»ی خۆیان دروستدەکەن بۆ دەربڕینی نیگەرانییە بەردەوام هەڵکشاوەکانی گەنجانی ناڕازی.

پەرلەمانەکە هەوڵدەدات کێشەی بێکاری و کەمی شوێنی نیشتەجێبوون و کۆچکردن بۆ ئەوروپاو پەراوێزخستنی گەنجان لە لایەن حزبە سیاسییەکانی کوردەوە و بەشێوەیەکی گشتی گوێنەدان بە سیاسەت چارەسەر بکات.

پەرلەمانەکە لە لایەن ڕێکخراوی تواناسازی لاوانی کوردستانەوە پێکهێنراوە، کە ڕێکخراوێکی ناحکومییە و ئۆفیسی سەرەکی لە شاری هەولێرە.

شاد موحەمەد، ٢٦ ساڵ، کە سەرپەرشتی پرۆژەکە دەکات، وتی: «دەمانەوێت ئەم پەرلەمانە دەنگی جیاواز کۆبکاتەوە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دیموکراسی داکۆکی لە ماف و داواکارییەکانمان بکەین».

پەرلەمانی لاوان، کە هێشتا لە چاوەڕوانی کۆبوونەوەدایە، لە سەرەتای ئەمساڵدا دروستکرا کاتێ کە گەنجانی کورد بە ئاشکراتر دەنگیان لەبارەی ئەو مەسەلانەی کاریگەری بەسەر هەرێمەکەیانەوە هەیە، هەواڵبڕی و ناڕەزاییان بەرامبەر بە هەردوو حزبی سەرەکی کورد، پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەرزکردەوە.

هەر لەو کاتەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە گەنجان بەشداری دەنگدانیان نەکرد لە پرۆسەی راپرسی دەستووردا، حزبەکان دەستیانکردووە بە هەڵمەتی بەڵێندان بە مەبەستی بەدەستهێنانی پشتگیری دەنگدەرانی گەنج بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق کە بڕیارە لە هەفتەی داهاتوودا سازبکرێت.

سازکەرانی پەرلەمانەکە هێشتا بڕیاری ئەوەیان نەداوە کە ئایا پەرلەمانەکە وەك پەرلەمانی تەقلیدی ئیشدەکات، بە هەڵبژاردنی ئەندامەکانی، یان ئەبێتە کۆبوونەوەیەکی رەسمییانەی سەرکردە و نوێنەرانی کۆمەڵەکانی لاوان.

رێکخراوی تواناسازی لاوانی کوردستان لە مانگی تشرینی یەکەمدا کۆنفرانسی ئامادەکاری سازکرد، کە نزیکەی ١٥٠ گەنجی کۆکردەوە، لەنێویاندا ئەندامانی حزبەکان و کەسایەتی سەربەخۆ و نوێنەرانی نزیکەی ٥٠ رێکخراوی لاوانی لە خۆگرتبوو لە سەرانسەری کوردستانی عێراق.

بیرۆکەکە بەو شێوەیەیە کە پێش ئەوەی پەرلەمان دانیشتنەکانی سازبکات، کۆبوونەوە و گفتوگۆی نارەسمی ئەنجامدەدرێت بۆ رێگەدان بە لاوان تا باس لە کێشەکانیان بکەن.

ئاسۆ عەبدوللەتیف، ٣٢ساڵ، هەڵسوڕێنەری پرۆژەکە لە سلێمانی، وتی:»دەمانەوێت خوێندنەوەیەکی وردمان بۆ ئەو کێشانەی لاوان هەبێت کە لایەنە سیاسییەکان بۆیان دروستکردووین«.

بەڵام بەرپرسانی حیزبی چاوەڕوانییەکی تریان لەو پەرلەمانە هەیە، رەشاد حسێن، جێگری مەڵبەندی یەکی رێکخستنی سلێمانی یەکێتی، رایگەیاند کە ئومێدەوارە پەرلەمانەکە هانی لاوان بدات بڕۆن بۆ دەنگدان، لەوبارەیەوە وتی:»گەنجان وەڕسبوون لە سیاسەت و وەك پێویست بەشداری لە هەڵبژاردنەکاندا ناکەن«.

هەرچەندە بە بڕوای چاودێران زۆرێك لە گەنجان رەنگە بەشداری دەنگدانەکانی پێشوویان نەکردبێت، بەڵام لە ئێستادا گەنجانی کوردستان چالاکتر بوون. مانگی پێشوو خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی خۆپیشاندانیان لەسەر کەمی کارەبا و سووتەمەنی و ئاو و کێشەی نیشتەجێبوون سازکرد و حزبە سیاسییەکانیان بە دەستوەردان لە کاروباری زانستیدا تۆمەتبارکرد.



ئازاد مارف، ١٩ ساڵ، خوێندکارێکە کە بەشداری لە خۆپیشاندانەکەی ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەمدا کرد، وتی: «ئەگەر پەرلەمانێکی تازەی خۆمانمان هەبێت بۆ دەربڕینی بەرژەوەندییەکانمان، ئەتوانین فشارەکانمان لەسەر حکوومەت چڕبکەینەوە».

هەریەك لە رەشاد حسێن لە یەکێتی و فەلەکەدین کاکەیی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی گەشبینیان کەمبوو سەبارەت بەوەی کە پەرلەمانە نوێیەکەی لاوان هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ناوەندی داڕشتنی سیاسەتی پەرلەمانی کوردستان هەبێت.

رەشاد ئاماژەی بەوەکرد کە رێکخراوەکانی لاوان تا ئەمڕۆ ناکاریگەر و پەرتەوازەن، بەڵام بەڵێنیدا کە ئەگەر پەرلەمانەکە کاربکات بۆ وەدەستهێنانی داخوازییەکانی گەنجان بەبێ جیاوازی و گوێدانە ئامانجی سیاسەت و ئایدۆلۆجی، ئەوا ئەوان بەتەواوەتی پشتگیری دەکەین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە گەنجان گومانیان لەوە هەبوو کە پەرلەمانی لاوان بەڕاستی سەربەخۆبێت، سالار ئیسماعیل، ٢٥ ساڵ، مامۆستا لە سلێمانی، وتی:»پەرلەمانی لاوان گەمەیەکی تری سیاسییە لە لایەن حزبەکانەوە، ئەوان ئەیانەوێت دەنگی نارەزایی لاوان دامرکێنن«.

لە لایەن خۆشییەوە شاد محەمەد دووپاتیکردەوە کە ئەگەر گەنجان بڕوایان بە پرۆژەکە هەبێت، حکوومەت ناتوانێت دەستی تێوەربدات.

ئەو وتی:»نامانەوێت ببێتە پەرلەمانی لاوان بۆ حزبەکان، بەڵکو دەمانەوێت فەزایەك و فرسەتێك بێت بۆ خزمەتکردنی گەنجانی سەربەخۆ و بێلایەن«.

**لاوانی کورد لە ناهەمواری باری ئابووری هەڵدێن**

**پاش هەراسانبوونیان لەدەست گەندەڵی و هەژاری، لاوانی کورد تاسەی ژیانێکی نوێ دەکەن لە ئەوروپا**

فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی

بە نیسبەت دیار عەبدوللا، کە شۆفێری تەکسییە و تەمەنی ٢٨ ساڵە، گەیشتن بە ئەوروپا بووەتە خولیایەکی سەری و هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانیدا باسیدەکات.

دیار لەمدواییەدا هەنگاوێک لە بەدیهێنانی خەونەکەی نزیکبووەوە کاتێک سەیارە نیسانەکەی فرۆشت بە ١١٠ وەرەقە و ڤیزایەکی سویدی کڕی.

ئێستا دیار هانی برادەرەکانی دەدات شوێنی بکەون چونکە وەکو خۆی دەڵێت هیچ ئایندەیەکیان لەم وڵاتەدا نییە. دیار وتی:»دەمەوێت رزگارم بێت لەو بێڕێزییەی بە مرۆڤ دەکرێت لەم وڵاتەدا«.

دیار یەکێکە لەو کۆمەڵە گەنجەی کە ژمارەیان لە زیادبووندایە و پارەیەکی زۆر دەدەن بۆ دەستکەوتنی ڤیزای وڵاتانی خۆراوا. بەڵام ئەوانەی کوردستانی عێراق بەجێدەهێڵن لەدەست ئەو توندوتیژیە هەڵنایەن کە عێراقی گرتووەتەوە چونکە شارو شارۆچکەکانیان دوورە لەو خوێنڕێژییەوە کە لە بەشەکانی تری عێراقدا ڕوودەدات. بەڵام ئەوان کۆچدەکەن چونکە وەکو خۆیان دەڵێن هەراسان بوون بەدەست گەندەڵی و هەژارییەوە.

شکار عەبدوڵا، ٢٣ ساڵ، کە دەرچووی کۆلێژی کشتوکاڵە باسی لەوەکرد کە هیوای بە بوونیادنانی ژیانێکی ماقووڵ لە کوردستاندا بڕاوە و بەرنامەی ئەوەی هەیە بچێت بۆ هەندەران. شکار زۆر هەوڵیداوە دابمەزرێت، بەڵام ئاماژەی بەوەکرد کە ئەگەر داشبمەزرێت ئەو مووچەیەی دەیدەن کەمە و بەشی ناکات. شکار وتی:» کاتێک دادەمەزرێیت ١٥٧ هەزارت دەدرێتی، تۆ بڵێی بە ١٥٧ هەزار دینار ژیانت دروست بکەیت و ماڵ وخێزان بژێنیت«.

ئەو کوردانەی ئەیانەوێت وڵات جێبهێڵن ڕوودەکەنە کۆمپانیاکانی گەشتوگوزار کە ئەتوانن کاروباری ڤیزا ڕێکبخەن بۆ وڵاتانی خۆراوا و ئەو کەسانەش کە ئەیانەوێت سەفەر بکەن ئەبێت لە ٨ هەزار دۆلارەوە تا ١٢ هەزار دۆلار بدەن.

حاجی بێستون خاوەنی کۆمپانیای لوبنان بۆ گەشتوگوزار لە سلێمانی رایگەیاند لە ماوەی سێ مانگدا نزیکەی ٩٠٠ ڤیزای تورکیای دابینکردووە، حاجی بێستون وتی:»زۆربەی مەعمیلەکانمان گەنجن«.



لاوانی کورد بە توندی ڕەخنەیان لە دەسەڵاتەکانی ناوخۆ گرتووە لەبەر ئەوەی دەسەڵاتداران بەپێی پێویست هەنگاویان نەناوە بۆ لەناوبردنی گەندەڵی و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران و باشترکردنی خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکان.

سێ مانگ لەمەوبەر، نەریمان محەمەد، ٣٥ ساڵ، کە میکانیکییەکی خەڵکی سلێمانییە، ڤیزایەکی لە نووسینگەکەی حاجی بێستون وەرگرت و سەفەریکرد بۆ سوید و لەدوای خۆیەوە پێنج منداڵ و ژنەکەی بەجێهێشت. لە پەیوەندییەکی تەلەفونیدا نەریمان وتی:» هەوڵدەدەم بە هەمان رێگە منداڵەکانم و خێزانەکەم رابکێشم بو سوید ئیدی بۆ هەتا هەتایە نایەمەوە کوردستان«.

زۆرێک لەوانەی دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣ دا گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان دەڵێن پەشیمانن و بەرنامەیان داناوە بۆ دووبارە گەڕانەوە بۆ هەندەران.

دلێر عومەر، ٣٠ ساڵ، کە ساڵی ١٩٩٨ سەفەری کردووە بۆ بەریتانیاو ساڵی ٢٠٠٤ گەڕایەوە بۆ کوردستان، وتی:» گەڕانەوەم بۆ کوردستان هەڵەیەکی گەورەبوو«، هەروەها وتیشی:»گرنگ ئەوەیە لە ئەوروپا گرفتی نەوت و کارەبا و ئاوت نییە«.

وەکو هەوڵێک بۆ دانانی سنوورێک بۆ کۆچکردنی لاوانی هەرێم بۆ دەرەوەی وڵات، دەسەڵاتداران بڕیاریانداوە کە پاسپۆرت تەنها بۆ خەڵکانی سەروو تەمەن ٢٧ ساڵ دەربکەن، هەرچەندە لایەنی پەیوەندیدار دان بەوەدا نانێن کە ئەمە سیاسەتێکی ڕەسمی بێت، بەڵکو دەڵێن لەبەر کەمی پاسپۆرت وا پێویست دەکات کە بەپێی ئەولەویەت پاسپۆرت بدەن بە خەڵک.

لیوا موحسین عوسمان، بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی پاسپۆرت و مانەوەی سلێمانی، وتی:»لەبەر ئەوەی ژمارەی پاسپۆرتمان کەمە ناچارین بیدەین بەو کەسانەی کە پێویستیانە وەکو نەخۆش و وەفدە حکومییەکان و ئەوانەی لە دەرەوەی وڵات دەورەیان هەیە«.

لەگەڵ ئەو هەوڵانەشدا گەنجە بێزارەکان لە هەوڵی رۆیشتن ناوەستن، ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆر لەوانەی سەفەر ئەکەن بەخت یاوەریان نابێت و سنوورداش ئەکرێنەوە.

ئاسۆ عەبدولرەحمان، ٢٨ ساڵ، یەکێك لەو گەنجانەیە کە لە فرۆکەخانەی ئەستەنبوڵ لە تورکیا بە تۆمەتی ساختەبوونی پاسپۆرتەکەی گەڕێنرایەوە. بەڵام ئەو باسی لەوەکرد کە نیازی نییە واز لە خەونی گەیشتن بە ئەوروپا بهێنێ. ئاسۆ وتی:»سەد جاری تر سنووورداشم بکەنەوە ئەو ڕێگەیە دەگرمەوە بەر، ئیتر یان دەگەمە ئەوروپا یان لەو ڕێگەیەدا دەمرم».

## کوردستانی عێراق بووەتە ئارامگەیەك بۆ عەرەبە ئاوارەکان

## چەندین خێزان لە بەغدا و شارەکانی تری عێراقەوە بۆ ڕزگاربوون لە باندەکانی کوشتن و شەڕی تایەفەگەری بەرەو باکوور هەڵدێن

فرمان عەبدولڕەحمان لە سلێمانی

سەلاح عەبدولوەهاب و ژنەکەی لە نووسینگەی بەڕێوەبەری تەندروستی سلێمانی دانیشتبوون و بە دوودڵییەوە چاوەڕێیان دەکرد، تا ئەوەی بزانن لە ئیشێکدا دائەمەزرێن و ژیانی نوێ دەستپێبکەنەوە. بەڕێوەبەری تەندورستی چاوی بە داوای ئەو دوو دکتۆرەدا دەگێڕا بۆ ئەوەی خزمەتیان لە شاری سامەراوە بگوازێتەوە بۆ ئەم شارەی کورستانی عێراق.

دکتۆر سەلاح کە پزیشکی پێستە، پاش ئەوەی مانگێك لەمەوپێش دکتۆرێکی هاوڕێی کوژرا، بڕیاریدا شاری سامەرا بەجێبهێڵێت، دکتۆر سەلاح وتی: «لە سامەرا کەس لە گیانی خۆی دڵنیا نییە و ڕۆژانە بە بەرچاوی خۆمانەوە هاوڕێ و خزم و کەسوکارەکانمان دەکوژرێن».

بە وتەی ئەو ژن و مێردە بۆیە سلێمانیان هەڵبژرادووە چونکە بە بەراورد بە ناوچە نائارامەکانی تری عێراق ئێرە وەك «بەهەشت» وایە.

ڕۆژانە خەڵکانی عەرەب ڕوودەکەنە شارەکانی کوردستانی عێراق لە باکوور بۆ ڕزگاربوون لە شەڕی تایفەگەری و هێرشی یاخیبووەکان کە زۆربەی ناوچەکانی باشوورو ناوەڕاستی عێراقی گرتووەتەوە.



هەرچەندە حکوومەتەکەی سەرۆك وەزیران نوری مالکی بەڵێنیداوە ئارامی و ئاسایش بەرقەراربکات، بەڵام ژمارەی قوربانییە مەدەنییەکان هەر لە بەرزبوونەوەدایە. بەرپرسان ژمارەی ئەو کەسانەی کە ڕۆژانە ئەکوژرێن بەهۆی شەڕ و توندوتیژی چەکدارییەوە بە ١٠٠ کەس مەزەندە دەکەن.

لە لایەکی دیکەوە بە هۆی ئەوەی کە بەدەستهێنانی ڤیزای سەفەرکردن ئەستەمە و کۆچکردن بۆ وڵاتانی دراوسێش پارەی زۆری ئەوێت، زۆر لە عێراقییەکان پەنادەبەن بۆ نزیکترین و ئارامترین و کەم مەسرەفترین شوێن، کە کوردستانە.

بەپێی ئاماری ئەنجوومەنی پارێزگای سلێمانی، لە مانگی حوزەیران تا مانگی ئەیلولی ٢٠٠٦ نزیکەی ١٠٠٠ خێزانی سوننە و شیعە ڕوویانکردووەتە شاری سلێمانی، بەمەش ژمارەی ئەو ٧٥٠٠ عەرەبەی بەرزکردووەتەوە کە لە پارێزگاکەدا بوون بۆ دەستکەوتنی ئیش.

جوتیار نوری، جێگری پارێزگاری سلێمانی، ڕایگەیاند دەسەڵاتدارانی کورد دەیانەوێت یارمەتی ئەو خەڵکانە بدەن کە لەتاو شەڕ و توندوتیژی هەڵدێن، جوتیار وتی:» دەرگامان والآیە بۆ پێشوازیکردن لەو ئاوارە عەرەبانە و هەرچیشمان پێبکرێت لە ڕووی مرۆییەوە بۆ پێشکەشکردنی هاوکاری بەرامبەریان ئەنجامی دەدەین».

جوتیار ئەوەشی وت کە لەگەڵ وەفدێکی UN گفتوگۆیان کردووە و بڕیارە لە ئایندەیەکی نزیکدا دوو کەمپ بکەنەوە لە پیرەمەگروون و باریکە کە دوو ناوچەی دەرەوەی شاری سلێمانین بۆ نیشتەجێکردنی ئەو ئاوارانەی توانای دابینکردنی کرێ خانوویان نییە .

بەپێی وتەی سەرچاوەیەك لە ئاسایش، عەرەبەکان پێش ئەوەی نیشتەجێبن لە ناوچەکانی کوردستان لە لایەن ئاسایشی ناوچەکانەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت بۆ دڵنیابوون لەوەی کە چەکداران دزە ناکەنە ناوچە کوردییەکانەوە. کاتێکیش کە موڵەت وەردەگرن ئەو کاتە ئازادن لەوەی لە چ شوێنێك نیشتەجێدەبن بەپێی مافی دەستووری.

بەڵام هاتنی لێشاوی ئاوارە عەرەبەکان بۆ سلێمانی، دانیشتوانی سلێمانی دابەش کردووە بەسەر دوو ئاڕاستەی جیاوازدا.

ئالان غەفور، ٢٥ساڵ، مامۆستا، کە هاتنی عەرەبەکان بۆ سلێمانی زۆر نیگەرانی کردووە، وتی:»هیچ متمانەیەکم بە عەرەب نییە و دەترسم لە دواییدا ئەو ئاوارانە نەڕۆنەوە و کەرکوکێکی تر دروست ببێت لە سلێمانی».

کەرکوك شاری دەوڵەمەند بە نەوت کە چەندین نەتەوەی جیاوازی تێدایە و هەریەکە بە کوردو عەرەب و تورکمان بانگەشەی خاوەندارێتی دەکەنو زۆربەی کات ناوەندی ململانێی کۆنترۆڵکردنە لە لایەن نەتەوە جیاوازەکانەوە.

بەڵام خەڵکانی تری وەك دڵخواز حسێن، ٢٨ ساڵ، کارمەندی حکوومەت، پێیوایە کە دابینکردنی یارمەتی و خزمەتگوزاری بۆ ئەو ئاوارانە کارێکی مرۆڤدۆستانەیە، دڵخواز وتی:» لە شەڕدا خەڵکانی بێتاوان زەرەرمەند ئەبن، لەبەر ئەوە دەبێت کورد یارمەتی ئەو خەڵکە بدات و بیانپارێزێت لە ئاگری شەڕی تایەفەگەری».

لەنێوان ئەو خێزان و خەڵکانەی کە هەڵدێن هەندێکیان لە بنەڕەتدا کوردن، ئەوانە چەندین ساڵی تەمەنیان لە بەغدا بەسەربردووە، بەڵام چیتر ناتوانن لەوێ بژین بەهۆی بارودۆخی ئەمنییەوە.

حەیدەر محمد، ٢٨ ساڵ، دوکاندار، کوردێکی دانیشتووی بەغدایە و هەر لەوێش لە دایکبووە، خێزانەکەی حەیدەر ٣٥ ساڵە لە بەغدا نیشتەجێن، بەڵام ئێستا بەهۆی ئەو نامە هەڕەشانەی هەڵدەدرایە ماڵەکەیانەوە ناچاربوون بەغدا بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، حەیدەر وتی:»مردن لەهەموو جێگەیەکی بەغدا هەیە و وای لیهاتووە کەس ناوێرێت بچێتە ناو پاسەوە یان بۆ مزگەوت یان چێشتخانە یان سەرتاشخانە چونکە لە هەموو ئەو جێگایانەدا تەقینەوەی گەورە رویانداوە و خەڵکێکی زۆریشی کوشتووە».

بەرپرسانی سلێمانی خۆشحاڵن بە هاتنی ئەو کەسانەی کە خاوەنی بەهرەو پیشەن وەك دکتۆر سەلاح و ژنەکەی. دەسەڵاتداران شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ دابین ئەکەن و مووچەشیان بۆ دابین ئەکەن.

جوتیار نوری وتی:»پێویستی زۆرمان بە خەڵکانی پسپۆر و مامۆستایانی زانکۆ و دکتۆر و ئەندازیار هەیە، چونکە قازانج بە شارەکە ئەگەیەنن».



## قوربانیانی ئەنفال گەشبین نین بە داهاتوو

## کەسوکاری ئەوانەی کە بوونەتە قوربانی قەسابخانەکانی سوپای عێراق، هەستدەکەن ئەم سەردەمە سیاسیە نوێیە دادپەروەری و مافەکانیان بەدی ناهێنێت

فرمان عەبدولڕەحمان لە ئۆردوگای رزگاری

نووری موحەممەدی تەمەن ٧١ ساڵ لەبەر تیشکی خۆردا بە خەمبارییەوە دانیشتبوو، قوولی هێڵە چرچبوەکانی نێوچەوانی ئاماژەبوون بۆ تراژیدیا و ناسۆرەکانی ژیانی، موحەممەد تەنها کەسی رزگاربووی نێو خیزانە ٩ نەفەرییەکەیەتی. ئەو پێنج کوڕ و دوو کچ و ژنەکەی، لە هەڵمەتی ئەنفالدا کوژران، کاتێك هێزەکانی سوپای سەدام حوسێن لە ساڵی ١٩٨٨ لەسەرانسەری کوردستانی عێراقدا ئەنجامیاندا.

موحەممەد مانگی رابردوو دەنگی بە «بەڵێ» دا بەمەبەستی قبوولکردنی دەستووری عێراق، کە هەندێك بڕوایان وایە ئەمە سەرەتایەکی زۆر گرنگە بۆ ئەو وڵاتەی کە جەنگ وێرانی کردووە. بەهەرحاڵ موحەممەدیش وەك هەر قوربانییەکی دەستی ئەنفال، هیوایەکی کەمی هەیە بەوەی کە دەستوور یاخود سیستمی سیاسی نوێی عێراق هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەسەر ژیانیدا بهێنێت.

موحەممەد وتی:» من دەنگم دا بە بەڵێ، چونکە سەرکردە سیاسییە کوردەکانمان داوایان لێکردبووین کە دەنگ بدەین»، هەروەها وتیشی:» بە بەشداریکردن لەم راپرسییەدا من تۆڵەی خۆم لەو بەعسییە عەرەبانە دەسەنمەوە کە هەموو خزم و کەسوکار و ئەندامانی خێزانەکەیان کوشتم، کەچی ئەوان هێشتا نایانەوێت عێراقێکی ئازادو جێگیر دابمەزرێت».

لەکاتی هەڵمەتی ئەنفالدا، هێزە عێراقییەکان هەستان بە ئەنجامدانی قەتلوعام و ئیعدام کردنێکی زۆر، هەروەها چەکی کیمیاویان دژی دانیشتووانە کوردەکانی

چەندین گوند و شارۆچکە بەکارهێنا. لەو هەڵمەتانەدا زیاد لە ١٠٠٠٠٠ کەسی تیادا کوژرا و هەندێکیشیان بێ سەروشوێن بوون کە حسابی مردوویان بۆ دەکرێت.

نزیکەی ١٨٢٠٠٠ کوردی مەدەنی و بێ چەك بێ سەرو شوێن کران و نێردران بۆ بیابانی نوگرەسەلمان لە باشووری عێراق. ڕێکخراوی هیومان رایتس وۆچ ئەم هەڵمەتانەی بە «پێشێلکارییەکی ئابڕوبەرانەی مافی مرۆڤ» ناوزەد کرد، هەر لەو هەڵمەتەدا نزیکەی ٢٠٠٠ گوندیش روخێنران.

ڕژێمی پێشوو، بەشێك لە رزگاربووانی هەڵمەتکەی ئەنفالی بە زۆر لە شارێکی تایبەت دروستکراوی زۆرە ملێدا کە پێی دەوترێت سموود (کە بەمانای خۆراگری دێت) لە پارێزگای سلێمانی نیشتەجێکرد. .

ئەمڕۆ رزگاری شارۆچکەیەکی زۆر هەژارە و زۆربەی خەڵکەکە خانووەکانیان لە قوڕ و دار و بەرد دروستکردووە و زۆربەشیان ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ لادێکانیان کە سووتێنرابوون و ئێستاش مینێکی زۆری تێدا چێنراوە.

لەبەر ئەوەی کە هەڵمەتی ئەنفال زۆربەی پیاوانی کردبووە ئامانجی خۆی، ئێستا زۆربەی ژنان بە تەنها ماونەتەوە و خەریکی راپەراندنی کارەکانی ماڵەوەیانن. لەوکاتەی کە بارودۆخی ئابووری خراپ بوو، کارکردن لە نێو کیلگە کشتوکاڵییەکانی دەوروبەردا کاری زۆربەیانی دابیندەکرد.

دەسەڵاتی ناوخۆیی هەندێك یارمەتی پێشکەشکردون، لەو چوارچێوەیەدا وەزارەتی ئاوارە و ئەنفال لە ئیدارەی سلێمانی، مانگانە بڕی ١٥٠٠٠٠ دیناری عێراقی بۆ ٨٥٠٠ خیزان بڕیوەتەوە.

دەمڕاستەکانی نەوەی بەجێماوی ئەنفال، داوا لە حکوومەتی عێراقی دەکەن قەرەبووی داراییان بکاتەوە و بەڕەسمی دان بە تراژیدیای ئەنفالدا بنێت وەکو تراژیدیایەکی مرۆیی. بەڵام چەند کەسێکی کەم بڕوایان وایە کە گوێ لەداواکارییەکانیان بگیرێت.



ئەحمەد سپی سەری، تەمەن ٢٦ ساڵ، وتی:» ئێمە دەزانین کە کەسوکارەکانمان مردوون، بەڵام داوا لەحکوومەتی عێراقی دەکەین کە زیانەکانمان بۆ قەرەبوو بکاتەوە».

بە پێی قسەی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان، زۆربەی دانیشتوانی ئەو شارۆچکەیە دەنگیان بە «بەڵێ» داوە بە دەستوور و رێژەی لە ٩٩٪ دەنگدەرانی ئەو شارۆچکەیە دەستووریان پەسەند کردووە. بەڵام زۆربەی دانیشتوانی رزگاری بەگومانن لە وەی پێکهاتەی یاسایی نوێی حکوومەتی عێراقی یان هەوڵەکانی بەرەو دیموکراسیەت هیچ مافێکیان بۆ دەستەبەربکات.

لە دەستوورەکەدا هیچ باسی قەربووی دارایی و پێشکەشکردنی هاوکاری بۆ قوربانیانی ئەنفال نەکراوە و تا ئێستاش پەرلەمان باسی ئەو کێشەیەی نەکردووە. پاشماوەی قوربانیانی ئەنفال بڕوایان بە سیاسەتمەدارەکان نییە، بەتایبەت بە عەرەبە سوونەکان کە وەختێك بوو حوکمی عێراقیان دەکرد، ئێستاش هیچ هاوسۆزییەکیان نییە بەرامبەریان تەنانەت ئامادەش نین دان بە تراژیدییەکەیاندا بنێن.

بەڵام مەنسوور حەمەکەریم، بەرێوەبەری کاروباری قوربانیانی ئەنفال لە وەزارەتی مافی مرۆڤ لە سلێمانی رایگەیاند کە ناوی هەموو بێ سەر و شوێنەکانی ئەنفال و شەڕی عێراق-ئێران و جەنگی کەنداوی ١٩٩١یان خستووەتە نێو فایلی تایبەت و ناردوویانە بۆ وەزارەتی مافی مرۆڤی عێراقی لە بەغداد.

لەگەڵ ئەو هەوڵانەشدا هەندێ لە پاشماوەی قوربانیانی هەڵمەتی ئەنفال، دڵنیا نین لە باشبوونی گوزەرانیان. رێواز سابیر، ٣٢ ساڵ، کە ئافرەتی ماڵەوەیە، وتی:» ئومێدێکی کەمم هەیە بە دەستوور»، هەروەك وتیشی:» هیچ زەمانەتێك نییە بۆ ئەوەی حکوومەتی نوێی عێراق جارێکی تر قەتل وعامان نەکاتەوە».

خونچە کاکە برا، ٥٣ ساڵ، ئافرەتی ماڵەوە، هاوڕابوو لەگەڵ رێوازدا سەبارەت بە ئایندەی ژیانیان، خونچە کە هەردوو کوڕەکەی لە کارەساتی ئەنفالدا لە دەستداوە، وتی:»هیچ ئومێدێکم نییە بە حکوومەتی نوێی عێراق، چونکە ئێستا سەدام لەسەر

حوکم لابراوه، بەڵام هێشتا ئێمه لەم ئۆردوگا زۆره ملێیانەدا دەژین که رژێمی پێشووی بەعس بەزۆر تیایدا نیشتەجێی کردبووین»، تەنانەت لەگەڵ دەستپێکردنی پرۆسەی دادگاییکردنی سەدامدا، وەکو تاوانبارێکی جەنگ، که بەردەوام خونچه هیوای بۆ خواستووه، کەچی هێشتا بێ هیوایه لەوەی که قوربانیانی ئەنفال و کەسوکارەکانیان له داهاتوودا مافی خۆیان وەربگرنەوه یاخود قەرەبوو بکرێنەوه.

سەرباری ئەو بۆچونه رەشبینانه، بەڵام هێشتا لای هەندێك، تروسکاییەك ئومێد ماوه. ئەحمەد سپی سەری، وتی:» هەموو شتێك به رووخانی سەدام کۆتایی هاتووه، چونکه لەو کاتەوەی کوردێك بووه به سەرۆك کۆمار سەردەمێکی نوێ دەستی پێکردووه»، هەروەها وتیشی:» ئەوه ئێمەی دڵنیا کردوەتەوه لەوەی که کورد جارێکی دیکه زەلیل نابێتەوه».

## کوردەکان گلەیی له تێکەڵ کردنی لیستی هەڵبژاردنکان دەکەن

## بەرپرسیاری سڕانەوەی ناوی هەزاران کورد

## له لیستی دەنگدەراندا خرایه ئەستۆی هەڵەی تەکنیکی، بەڵام بێ متمانەییەکی قووڵ بەرامبەر به بەغداد دروست دەکات

فرمان عەبدولڕەحمان له هەولێرو تەلار نادر له سلێمانی

رۆژی هەڵبژاردن سلێمانی کەشێکی کەرنەڤاڵئامێزی بەخۆیەوه بینی، بەڵام که خوشکان فاتح له دەنگدان گەڕایەوه ماڵەوه، هەستی هەموو شتێکی هەبوو خۆشی نەبێت.

ئەو فەرمانبەره تەمەن ٢٥ ساڵەیه جله کوردییەکەی فڕێدا، که زۆربەی ژنان لەو رۆژەدا لەبەریانکردبوو، هەروەها میکیاجەکەشی لابردوو له جێگادا راکشا بۆ ئەوەی بخەوێت.

دواتر به توڕەییەوه وتی:»عەرەب ئاوان، جاران کاتێ دەسەڵاتیان هەبوو، به کیمیایی لێیان دەداین. ئێستاش ناومان ئەسڕنەوه بۆ ئەوەی نەتوانین دەنگ بدەین.»



خوشکان یەکێك بوو لەو هەزاران خەڵکەی ناوچەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق که ناوەکانیان له لیستی تۆماری دەنگدەراندا نەبوو بۆ بەشداریکردن له هەڵبژاردنه پەرلەمانییەکەی ئەم هەفتەیەدا.

بەرپرسانی هەڵبژاردن له کوردستانی عێراق و شاری سلێمانی رایانگەیاند که ئەوان ناوی دەنگدەرانیان ناردبوو بۆ نووسینگەی سەرەکی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق له بەغداد. بەڵام کاتێ که کۆمسیۆنی بەغداد لیستی کۆتایی ناردبوویەوه هەزاران ناو له لیستەکاندا نەمابوون.

کۆمسیۆن و بەرپرسانی نێودەوڵەتی وتیان که ناوەکان به هۆی هەڵەی تەکنیکییەوه له بەغداد نەماون. بەڵام له بەرئەوەی که ئەو کێشەیه تەنها له ناوچه کوردییەکاندا هەبوو، بۆیه هەستێکی دژ به عەرەبی لێکەوتەوه له نێو کورداندا، که نەتەوەیەکن له ژێر حوکمی سەدام حوسەیندا چەوسێنرابوونەوه.

کێشەکه چەند رۆژێك پێش هەڵبژاردنەکەی ١٥ی کانوونی یەکەم له شاری کەرکوکی فره نەژاددا سەریهەڵدا. بەرپرسانی هەڵبژاردن تێبینی ئەویانکرد که ١٩٦ هەزار له کۆی ٦٩١٤١٠ دەنگدەر ناویان له لیستی رەسمیدا نییه و زۆربەشیان ناوی کوردبوون.

دەسەڵاتدارانی کورد هەوڵیاندا که ئەو ناوانه بخرێنەوه سەر لیستەکان. زۆربەی دەنگدەران توانیان له رۆژی هەڵبژاردندا دەنگبدەن، بەڵام ناوچەکانی تریش ئەو کێشەیەیان توشبوویەوه.

له رۆژی هەڵبژاردندا ناوی ٣٠ هەزار دەنگدەر له لیستەکانی تۆماری دەنگدەران له پارێزگای دهۆك له باکووری رۆژئاوای عێراق نەمابوون. بەرپرسانی هەڵبژاردن لەو ناوچانه پەنایانبردە بەر لیستی دەنگدەرانی ریفراندۆمی دەستوور له مانگی تشرینی یەکەم، هەواڵەکانیش ئەوەیان راگەیاند که کۆمسیۆن له بەغداد بەو کاره رازیبووه.

له سلێمانیش، بەرپرسانی کۆمسیۆنی هەڵبژاردن ئاماژەیان بەوەکرد که نزیکەی ١٠ هەزار ناوی دەنگدەر نەمابوون کاتێ که لیستەکان له بەغداد نێردرابوونەوه. به

هەمان شێوە لە هەولێر بەرپرسانی هەڵبژاردن مەزەندەیانکرد کە چەند هەزارێك ناویان نەهاتووەتەوە. هەروەك موسڵیش کە شارێکی فرە نەژادە هەمان کێشەی هەبوو.

ئەم کارە وای لە هەندێك لە هاوڵاتیانی کورد کرد گومانی ئەوەیان هەبێت کە حکوومەتی بەغدا هەوڵیداوە وەك بازنەیەکی هەڵبژاردن پەراوێزیان بخات.

دارا موحەمەد، خوێندکارێکی تەمەن ٢٠ ساڵ لە سلێمانی، وتی:»دیارە ئەمە پیلانێکە دژ بە کورد، کۆمسیۆن لە بەغداد کێشەی بۆ کەرکوك و موسڵ دروستدەکرد. ئێستا گەیشتنە سلێمانی و هەولێریش. بەڵام خەتای سەرکردەکانی خۆمانە چونکە نەرمن لەگەڵ عەرەبدا».

بەڵام میران ئەحمەد تەمەن ٢٨ ساڵ دوکاندارە، بۆچوونێکی جیاوازی هەبوو. ئەو پێیوابوو کە دەنگە دیارنەماوەکان کار لە ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکە ناکات.

میران وتی:»لە راستیدا بەرنامەرێژی بە باشی نەکرابوو بۆ هەڵبژاردنەکە، نەك بوونی پیلانێك لە دژی کورد.»

لە لایەن خۆشیەوە بەرهەم ئەحمەد ساڵح، سەرۆکی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لە سلێمانی، رایگەیاند کە ئەو داوای لە ئەشرەف قازی، نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان کردووە کە لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکە بکات.

هەندێ لەوانەی ناویان لە لیستی دەنگداندا نەبوو، وەکو خوشکان فاتیح چانسی دەنگدانیان پێنەدراو بەو هۆیەوە نەیانتوانی دەنگ لەسەر دەستوور بدەن.

زانا رەئوف، بەرپرسی ناوەندێکی دەنگدان کە ناچاربوو بە رەتکردنەوەی ئەو دەنگدەرانەی کە ناویان لە لیستەکاندا نەبوو، زانا وتی:»خەڵك ژنیان لەناو بەتانیداو پیاویان بە کورسی عەرەبانە ئەهێنا، نەمتوانی رێگەیان پێبدەم بۆ دەنگدان چونکە دەبوایە پەیرەوی یاسا بکەم».

لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسانی هەڵبژاردن و چاودێران رێژەی بەشداریکردنیان لە هەر سێ پارێزگا کوردییەکەدا بە ٧٠-٨٠٪ مەزەندەدەکرد. لە کەرکوك، کە شارێکی



زۆرینەی کوردە و دانیشتوانی عەرەب و تورکمانیشی هەیە، رێژەی بەشداریکردن بە ٧٠٪ مەزەندەکرا کە هەمان رێژەی بەشدارییە لە ئاستی وڵاتدا. چاودێران و بەرپرسانی هەڵبژاردن هەواڵی هیچ سەرپێچییەکی گەورەیان رانەگەیاند، بە پێچەوانەی هەڵبژاردنەکانی مانگی کانوونی دووەم و راپرسی دەستوور لە مانگی تشرینی یەکەمدا.

هاوپەیمانی کوردستان، کە حاڵی حازر ٧٧ کورسی پەرلەمانی لە ٢٧٥ کورسییەکەی پەرلەمانی عێراقدا هەیە، چاوەڕواندەکرێت کە بەشی شێر لە دەنگەکانی کورستانی عێراقدا وەدەستبهێنێت. شرۆڤەکارانی سیاسی باوەڕیانوایە کە هاوپەیمانییەکە ژمارەیەك کورسی لە دەست ئەدات بەهۆی بەشداریکردنی لیستەکانی عەرەبی سوننەوە لە هەڵبژاردندا.

ساڵح عەزیز،٣٩ ساڵ، دووکاندار، وتی:»پێشتر خەباتی چەکداری و شەڕی خوێناویمان دەکرد بۆ چەسپاندنی مافەکانمان. ئەمڕۆ شێوازی خەبات گۆڕاوە بۆ شەڕی سیاسی. دەمانەوێت مافەکانمان لە رێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە وەدەستبهێنین».

دوو حزبە کوردییە سەرەکییەکەی هاوپەیمانی کوردستان، یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە بەشی رۆژهەڵاتی کوردستانی عێراق بەڕێوە دەبات و پارتی دیموکراتی کوردستان کە بەشی رۆژئاوای لە ژێردەستدایە، پێش هەڵبژاردنەکان لە لایەن ژمارەیەك لە دەنگدەرانەوە رەخنەی توندیان لێگیراو تاوانباریان کردن بە بوونی گەندەڵی و نەتوانینی دابینکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان.

یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان، سێیەم حزبە لە کوردستانی عێراق کە لە هەڵبژاردنەکانی مانگی کانوونی دووەمدا بەشێك بوو لە هاوپەیمانی کوردستان، ئەمجارە لیستێکی سەربەخۆی هەبوو دروشمەکەیشی بریتی بوو لە سەرکردایەتییەکی بێ گەندەڵی.

هێرۆ سالّح، خوێندکارێکی تەمەن ٢٢ ساڵە کە دەنگی بۆ یەکگرتوو دابوو، وتی:»دەنگمدا بۆ کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتدارانی گەندەڵ و بۆ ئەوەی مافی هەموو کەسێك بە عەدالەتی بدرێت».

سەلاحەدین موحەمەد بەهادین، ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان، لە ناوەندێکی دەنگداندا لە هەولێر لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەندام و پاسەوانەکانی لە لایەن پاسەوانانی ئاسایشەوە بە قۆناغە تفەنگ لێیاندرا کاتێ کە دەچوون بۆ دەنگدان. حەمە رەشید ماوەتی، ئەندامێکی باڵای ئەو حزبە ئاماژەی بەوەکرد کە وەزارەتی ناوخۆ ٤١ پۆلیس و ئاسایشی لەو ناوەندی دەنگدانەدا دەستگیرکردووە.

هەر لەو چوارچێوەیەدا ماوەیەکی کەم پێش ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان چوار ئەندامی حزبەکە، کە یەکێکیان پلەی بەرزی هەبوو، تەقەیان لێکراو کوژران لە لایەن پۆلیسەوە لە دهۆك.

ماوەتی وتی «تەسەوری ئەوەماندەکرد کە پارتی فشار بخاتەسەرمان، بەڵام تەسەورمان نەدەکرد بەو شێوەیە هێرشمان بکرێتە سەر».

بەرپرسانی یەکگرتووی ئیسلامی رایانگەیاند کە هێرشەکە ئەزموونی دیموکراتی و پێکەوەژیانی لە کوردستاندا لەکەدار کرد.

بەڵام محەمەد مەلا قادر، ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، وتی:»پێئەچێت ئەوانەی هێرشیانکردبێتە سەر یەکگرتووی ئیسلامی نەتەوەپەرستی کوردستان بووبن کە باوەڕیان وابووە ئەو حزبە خیانەتی لێکردوون بە جیابوونەوە لە هاوپەیمانی کوردستان».

ئەو ئەندامەی مەکتەبی سیاسی پارتی وتیشی:»ئێمە هیچ کێشەیەکی سیاسی یان مێژووییمان لەگەڵ یەکگرتووی ئیسلامی کوردستاندا نییە».



## سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی

## خەونی هەموو رۆژنامەنووسێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

فرمان عەبدولرەحمان لە قەتەر

بۆ محەمەد دۆسەری، ٤٢ساڵ، کە رۆژنامەنووسێکی بەحرەینییە، شانازییەکی گەورەیە بەشداریکردن لە کۆرسێکی راهێنانی رۆژنامەوانی سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی بۆ راهێنان و گەشەپێدان.

محەمەد کە خەونی رۆژنامەوانی هەرە گەورەی دەرکەوتنییەتی وەکو پێشکەشکارێکی پرۆگرامە گفتوگۆئامێزەکان، بەشداری کۆرسی پرۆگرامی گفتوگۆئامێزی کردبوو لە سەنتەری ناوبراودا. هەرچەندە خۆی ماوەی ٣ ساڵە وەکو رۆژنامەنووسێك لە تەلەفیزیۆنی سەحرای بەحرەینی کار دەکات، بەڵام پێیوابوو بەشداریکردن لە کۆرسی راهێنانی سەنتەری جەزیرەدا هەنگاونانە بەرەو کاری رۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵ. محەمەد هۆکاری پەیوەندی کردنی بە سەنتەری جەزیرەوە گەڕاندەوە بۆ ئەو ناوبانگەی کە سەنتەرەکە هەیەتی لە بواری راهێنانی راگەیاندندا، ئەمە جگە لەو کەشە ئیعلامی و زانستییەی لە نێو ئەو سەنتەرەدا فەراهەم بووە کە یارمەتی زیاتر ئاوێتە بوونی بەشداربووان دەدات لەگەڵ پرۆگرامەکانی راهێناندا. ئەو وتی «سەرباری ئاشنا بوون بە زانیاری و راهێنانی جدی، کۆبوونەوەی ئەو هەموو رۆژنامەنووسە جیاوازانەی کە هەریەکەیان لە وڵاتێکی عەرەبییەوە هاتوون هەستێکی چێژبەخشت پێدەبەخشێت».

سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی بۆ راهێنان و گەشەپێدان یەکێکە لە دامەزراوە گرنگەکانی تۆڕی کەناڵی ئەلجەزیرە، کە لەساڵی ٢٠٠٤دا دامەزراوە بەمەبەستی پێشکەشکردنی راهێنانی تەواو بۆ رۆژنامەنووسان و دامەزراوە ئیعلامییەکان چ لەسەر ئاستی ئیقلیمی و چ لەسەر ئاستی جیهانی.

د. عەمار محەمەد شێخ بەڕێوەبەری چالاکییەکانی راهێنان لە سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی ئاماژەی بەوەکرد کە سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی وەك بەشێك لە پرۆژەی

جەزیرە، ئامانجی ئەوەیە بەشداری زانستی و پراکتیکی بکـات لـە بـەرەو پێـشبردن و پەرەپێدانی راگەیاندنی عـەرەبی و جیهـانی، ئـەویش بـە قوولکردنـەوەی هۆشـیاری ئیعلامی و گەشەپێدانی بەهرە و توانستەکان و ئـالوگۆڕکردنی پـسپۆڕی و شـارەزایی لەبوارە جیاجیاکانی راگەیاندندا.

د. عـەمار محەمـەد وتـی « ئـەم سـەنتەرە سـەنتەرێکی ئیقلیمییـە و یەکـەم دامەزراوەی لەو شێوەیەیە لەسەر ئاستی جیهانی عەرەبی، لە رووی ئامانج و پرۆگرام و چالاکی و ئەو کەسانەی راهێنانیان پێدەکرێت».

سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی تەنها گرنگـی بـە بـواری رۆژنامەگـەری تەلـەفزیۆن نادات بەڵکو هەرسێ بواری رۆژنامەگەری بینراو، بیستراو، خوێنراو دەگرێتەوە، جگـە لەوەش خولی راهێنان لە ٤٠ بواری جیاوازی راگەیاندندا پێشکەشدەکەن.

رەغدا بووندوق، ٣٦ ساڵ، رۆژنامەنووسێکی میـسری بـوو بـۆ بەشـداریکردن لـە کۆرسی بەرهەمهێنانی فیلمی دۆکیۆمێنتاری بەشداری سەنتەری جـەزیرەی ئیعلامـی کردبوو، هەرچەندە دەرچووی بەشی تەلەفیزیۆنی کۆلێژی راگەیانـدنی زانکـۆی عـەین شەمسی میسری بوو، بەڵام پێیوابوو ئەوەی لە کۆرسی راهێنانی سـەنتەری جـەزیرەی ئیعلامی فێری بووە هاوتای ساڵێکی خوێندنەکەی بـووە لـە زانکـۆ. رەغـدا وتـی « بوونی وانەی پراکتیکی بەهێز لەو کۆرسانەدا خیـبرەی زیـاترت پێدەبەخـشن چـونکە سەنتەرەکە پڕچەککراوە بە هەموو تەکنیکێکی پێشکەوتوی راگەیاندن».

سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی لە ماوەی دوو سـاڵی رابـردوودا ١٦٠ کۆرسـیان لـە بوارە جیاوازەکـانی راگەیاندنـدا کردۆتـەوە کـە ٢٢٢٠ کـەس بەشـداریان کـردووە و راهێنانیـان بینیـوە، لـەو رێژەیـە ١٦٪ رۆژنامەنووسـی عیراقـی بـوون و ٥٧٪ی بەشداربووانیش بەشداری رۆژنامەگەری تەلەفیزیۆنیان کردووە. هەرچـەندە کۆرسـەکان بە پارەیە و بەشداربوو بۆ بەشداریکردن لە هەرکۆرسێکدا دەبێت پارەیەکی دیـاریکراو بدات، کە لە نێـوان ١٠٠٠ دۆلار بـۆ ٤٥٠٠ دۆلاردایـە بـە پێـی گرنگـی و درێـژی کۆرسەکە.



بەڵام د. عەمار محەمەد شێخ ئاماژەی بەوەکرد کە سەنتەرەکەیان دامەزراوەیـەکی قازانج نەویست و نابازرگانییە و ئەو بڕە پارە رەمزیـەش کـە وەردەگیرێـت لـە کـارە خزمەتگوزارییەکاندا سەرفدەکرێتەوە.

د. عەمار وتی « پێموانییە نرخی بەشداریکردنی کۆرسەکان بەرزبێت، چونکە ئەو خزمەتگوزارییە زانستی و راهێنانە پراکتیکیانەی پێشکەشی بەشداربووان دەکرێت بە پارە ناخەمڵێنرێت».

سەنتەرەکە لە روبـەرێکی ١٢٠٠ مـەتر دوجـادا دروسـتکراوە و ئامـادەکراوە بـە پێشکەوتووترین تەکنیکـەکانی راگەیانـدن و لـە چـەند بەشـێك پێکهـاتووە، لەوانـە ستۆدیۆی تەلەفیزیۆن، ژووری هەواڵ، ستۆدیۆی رادیۆ، یەکەی مۆنتاژ بە بەکارهێنانی پێشکەوتوترین پرۆگرامەکانی ئەو بوارە وەکو (news edit, final cut pro, avid) ، لەگەڵ بەشـێکی دیزاینـی هونەریـدا.

ئەمە جگە لەوەی کە سـەنتەری جـەزیرەی ئیعلامـی لەگـەڵ چـەند دامەزراوەیـەکی گرنگی ئیعلامیدا لەسـەر ئاسـتی جیهـان گرێبەسـت و کۆنتـاکتی هەیـە و چـەندین راهێنەری نێودەوڵەتی و بە توانا لە سەنتەرەکە وانە دەڵێنەوە، ئەو دامەزراوانەی کـە سەنتەرەکە گرێبەستی هەیە لەگەڵیاندا بریتین لە (دامەزراوەی تۆمـسۆنی بـەریتانی، پەیمانگـەی بـاڵای رۆژنامـەوانی لـە فەرەنـسا، سـەنتەری نێودەوڵـەتی راهێنـانی رۆژنامەنووسـان لـە فەرەنـسا، رێکخـراوی جـیتراك، رێکخـراوی یونـسکۆ، کۆلێـژی راگەیاندنی زانکۆی میسۆری لە ئەمریکا) و چەندان دامەزراوەی تر.

رەسل ئـایزاك، راهێنـەر و راوێـژکاری رۆژنامـەوانی لـە دامـەزراوەی تۆمـسۆنی بەریتانی، کە ماوەی چەند مانگێك بوو لە شاری دۆحەی پایتەخی قەتـەر نیـشتەجێ بوو بۆ وتنەوەی چەند کۆرسێکی رۆژنامەوانی، باسی لەوەکرد کە سەنتەری جـەزیرەی ئیعلامی یەکێکە لە پرۆژە عیملاقەکانی جیهانی عەرەبی و ئومێـدی فـراوان بـوون و گەشەکردنی زیاتری لێـدەکرێت، هـەروەها پێیوابـوو سـەنتەری راهێنـان لـە هـەموو دامەزراوەیەکی ئیعلامیدا یەکێکە لە زەرورەتە گرنگەکانی کاری ئیعلامی، هەر بۆیە

بوونی سەنتەرێکی لەو شێوەیە لە پرۆژەی جەزیرەدا هۆکارێکی سەرەکییە بۆ گەشەکردنی تۆڕی کەناڵی جەزیرە.

رەسڵ ئایزاك وتی»کاری راگەیاندن لە جیهانی عەرەبیدا لە ئاستێکی زۆر دواکەوتوودایە، ئەوەش وایکردوە زۆر ماندوو ببین لەگەڵ بەشداربووانی کۆرسەکاندا کە زۆربەیان عەرەبن».

هەرچەندە دەستکردن بە بوونیادنانی سەنتەری جەزیرەی ئیعلامی لە ساڵی ٢٠٠٢ەوە دەستپێکرد، بەڵام تاوەکو لە لایەن رێکخراوی یونسکۆی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ئیعتیرافی پێنەکرا دەستی بە کارو پرۆژەکانی نەکرد، هەربۆیە لە ئێستادا سەنتەرەکە توانای بەخشینی بڕوانامەی دبلۆمی راهێنانی هەیە کە باوەڕپێکراوی رێکخراوی یونسکۆیە.

مەها ئیبراهیم، ٢٤ ساڵ ، کچێکی رۆژنامەنووسی خەڵکی لوبنانە، بە ئومێدی دەستکردن بە کاری بێژەری لە تەلەفیزیۆنی ئەلعەقارییە، بەشداری کۆرسێکی بێژەری تەلەفیزیۆنی کردووە لە سەنتەری جەزیرەی ئیعلامیدا. مەها وتی «شەرەفێکی گەورەیە لە شوێنێکی وا گرنگ و ناوداردا بڕوانامە بە دەستبهێنم»، هەروەها وتی» رۆژنامەنووسی زانستێکە بەردەوام پێویستی بە تازەکردنەوەی زانیاری و بەهرە و تواناکانت هەیە، بۆ ئەوەی گەشەکردن لە پیشەکەتدا مسۆگەر بکەی».